یەکەمین گۆڤاری کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا

29

لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا


# بڕیار




مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی

ساڵی سێیەم تشرینی یەکەمی ٢٠١٠


## پەندێک بۆ هەموو سەردەمەکان

## هەستێک بۆ خۆشەویستان

## نهێنی دەوڵەمەندبوون

## ئاکامی بڕوا بەخۆنەبوون

## بووەستە خاڵی پشکنینە!

## گوڵدانی عەشق...

## بە منداڵەکەت مەڵێ... بەڵکو پێی بڵێ...

The first Magazin Especializined in Management and Human Development in Kurdistan

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی
ساڵی سێیەم – ژمارە 29 – تشرینی یەکەمی 2010

**بەڕێوەبەری نووسین**
**بەرزان ئەبوبەکر**

**سکرتێری نووسین**
**ئەسکەندەر ڕەحیم**

**ب: پەیوەندییەکان**
**محەمەد هاشم محەمەد**

**دەستەی نووسەران**
**هاژە شێروانی** **پەیمان بەرزنجی**
**بێگەرد فارس** **پەری شێخ کەریم**
**وەهاب حەسیب** **محەمەد مێرگەیی**

**ڕاوێژکاری یاسایی**
**پارێزەر: ئازاد محێدین**

**دیزاین**
**جەمال دەروێش**
**قەیدار ڕەحیم**
**پشتیوان عەبدولڕەحمان**

**بەشی ڕیکلام**
07480112787

**حساب بانکی گۆڤار**
بانکی کوردستانی نێودەوڵەتی سلێمانی 3371

**خاوەنی ئیمتیاز**
**ئەندازیار مەسعود تاهیر ڕۆژبەیانی**

**سەرنووسەر**
**عادل محەمەد شێخانی**
sarnosar@yahoo.com


6

8

18

22

39

44


**بۆ دابەشکردنی بڕیار**

هەولێر: خانەی سیروان ٠٧٥٠٤٦٧٢٩٦٣
کەرکوک: ٠٧٧٠٨٥٦٣٧٢٤ هەڵەبجە: ٠٧٧٠١٩٣٣٩٦٧ - ٠٧٥٠١١٢٩٤٢٧
دەربەندیخان: ٠٧٧٠١٥٨١٠١٨ کفری: ٠٧٧٠١٥٦٦٨٧٦ کەلار: ٠٧٧٠٢١٠١٢٨٨
چەمچەماڵ: ٠٧٧٠٨٥٥٠٥٨٦ کۆیە: ٠٧٧٠١٥٤٩٧١٤ سۆران: ٠٧٥٠٤٥٠١٩٣٣
چۆمان: ٠٧٥٠٤٥٦٧٩٩٢ قەڵادزێ: ٠٧٧٠١٥٨٥٢٠١ ڕانیە: ٠٧٧٠١٥٨٠٤٤٢

**ناونیشانی گۆڤار**

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری سلێمانی مۆڵ- نهۆمی دووەم
بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردە
٣١٩٣٩٤٦ ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢
E-mail: bryarmagazin@gmail.com
هەولێر ٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠

**چاپخانەی سەردەم**
نرخ 2500 دینار

گرنگترین
دیاردەی گەلانی
شارستانی و
خاوەن ژیار،
گرنگیدانە بە
بچکۆلەکانیان.
rasan
group
ئەم لاپەڕەیە بە سپۆنسەری
گروپی کۆمپانیاکانی ڕەسەن بڵاو دەکرێتەوە

# چوار هونەرەکەی ژیان

لەگەڵ سەرەتای هەموو ساڵێکی خوێندنی زانکۆدا بابەتو گازندەو ڕەخنەی زۆر دێنە گۆڕێ، خەڵکی چاوەڕوانی زۆر شت دەکەنو کەمیان دەست دەکەوێت، بەرهەمی چوار ساڵی زانکۆ بە کەم دەزاننو زۆرجار بە ڕەنجێکی بێبەری لە قەڵەم دەدەن.

ئەمەش لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە ئێمە بۆ فێربوونو زیادکردنی ماریفەت تەنها ڕێگەی فێرکردنو تەڵقین دەزانینو پێمان وایە دەبێت هەموو شتێک فێر بکرێینو هەموو وردەکارییەکمان بۆ باس بکرێت، هەروەکو چۆن فێربووین کە وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەینەوە کە لە پەڕاوو کتێبەکانی زانکۆدا باسکراونو هەر شتێکی دیکەمان لێ بپرسن، بە وەڵامی نەمانخوێندووە وەڵام دەدەینەوە!

زانکۆ هەوارگەی زانستو ماریفەتو گرانەوەیە بە ڕووی ئاسۆ فراوانەکانی ژیانو دەوروبەردا.

لە زانکۆدا کلیلی زانست گەلێکی نوێ وەردەگرینو لە قۆناغێکی باڵادا بۆ زانستو زانیاریو ڕۆشنبیری دەگەڕێین!

بە مامۆستایانی نوێو زانستخوازانی نوێو سەرچاوەی نوێ ئاشنا دەبین.

لە زانکۆدا فێری خوێندنەوەی زیاترو موتاڵاو گفتوگۆو لێکۆڵینەوەو توێژینەوە دەبین.

لە زانکۆدا بە شێوەیەکی ئەکادیمی بابەتەکان دەکەینە ژێر باسو لێکۆڵینەوەی زانستییەوە.

بەم شێوەیە دەتوانین لە زانکۆدا شتێک فێر بینو بە پلیکانەی زانینو ماریفەتدا بەرەو لوتکەی بڕوانامە جیهانییەکان بچین.

لەگەڵ ئەوەشدا بە ڕای من ئەگەر لە چوار ساڵی خوێندنی زانکۆدا فێری چوار هونەرە سەرەکییەکەی ژیان ببین، ئەوا سوودێکی زۆرمان وەرگرتووەو ڕەنج بە خەسار نەبووین.

ئەو هونەرانەش بریتین لە: (هونەری گوێگرتن، هونەری ئاخاوتن، هونەری خوێندنەوە، هونەری نووسین).

لە دوای چوار ساڵ، هەم هونەرمەندێکی کارای گفتوگۆو ئاخاوتن بین، ئەوا گەورەترین خزمەت بە ڕەوتی تێگەیشتنو بیرکردنەوەی خۆمان پێشکەش دەکەین.

بۆئەوەی وتەبێژێکی باش بین، پێویستە سەرەتا گوێگرێکی بە ئارامو بە سەلیقەو هێمنو ورد بین.

ئەگەر دوای چوار ساڵ خوێندن خوێنەرێکی باشو هاوڕێیەکی باشی کتێب بینو سەرمایەمان کتێبخانەکەمان بێت، ئەوا سوودێکی باشمان لە زانکۆ وەرگرتووە.

ئەگەر دوای چوار ساڵ زانکۆ شارەزایی نووسینو پەخشو بڵاوکردنەوە بینو هیچ نەبێت زمانێکی بیانی فێربینو دەلاقەیەکمان بە ڕووی ئەدەبو کلتوری گەلاندا کردبێتەوەو دەستمان قەڵەم بگرێت، ئەوا دڵخۆشین کە گەورەترین سوودمان لە خوێندنو زانکۆ وەرگرتووە.

بەڵام خوانەکات ئەگەر دوای ئەم ماوەیە جگە لە پارچە کارتۆنێکو وێنەیەکی قەشەنگی ڕۆژی دەرچوون، شارەزای هیچ کام لەم هونەرانە نەبووین.

ئەوا دەبێت بڵێین: سڵاو لە خۆمانو خوێندنی زانکۆمان.

# کارگێڕی بە گوفتار

خۆزگەی چاکە بۆ دراوسێکەت بخوازە، دەبینیت چاکە خۆی دەکات بە ماڵەکەتدا!

یوسف تیناوی

مێشوولە دەموچاوی شیرفرۆش دەناسێت!

پەندێکی کوردی

قسەکردن خەرجکردنەو گوێگرتن کاسپی کردن!

پەندێکی ئەرجەنتینی

ئەوانە دەوڵەمەندن کە برای دڵسۆزیان هەیە!

تۆماس ڤۆلەر

مرۆڤ تا سنگی تەسک بێتەوە، زمانی فراوان دەبێت!

جۆن لوک

ئەوەی خۆی بناسێت، قسەی خەڵک زیانی پێ ناگەیەنێت!

مالیکی کوڕی نەبی

کارگێڕی بە چیرۆک

# پەندێك بۆ هەموو سەردەمەکان

پاشایەك ڕاوێژکارەکانی خۆی بانگکردو داوای لێکردن کە پەندو ئامۆژگاری زەمانە لە کۆنەوە تا ئێستا تۆمار بکەن، تا نەوەکانی دواڕۆژ سوودی لێ وەربگرن.

ئەوانیش دوای هەوڵدانێکی زۆرو کارێکی بەردەوام توانیان چەندین بەرگ لە کتێبی گەورە بنووسنەوەو پەندو حیکمەتەکانی تێدا تۆمار بکەن، دوای ئەوەی پادشا چاوی بە کتێبە گەورەکان کەوت، ڕاوێژکارەکانی بانگکردو پێشنیاری بۆ کردن کە ئەو کتێبانە زۆر گەورەن‌و خەڵکی ئارەزووی خوێندنەوەی ناکەن‌و نایخوێننەوە!!

لەبەرئەوە داوای لێکردن کە کورتی بکەنەوە، ڕاوێژکارانیش دەستیان بە کورتکردنەوەی کردو لە کۆتاییدا لە دوو توێی کتێبێکدا کۆیان کردەوە!

بەڵام دیسان پادشا بە زۆری زانی‌و پەسەندی نەکرد، ئەوانیش کورتیان کردەوە، بۆ پارچە نووسراوێکی کورت، دیسان ئەویشی هەر بە دڵ نەبوو!

دواتر کورتیان کردەوە بۆ یەك لاپەڕە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر بە درێژی زانی!!

لە کۆتاییدا ڕاوێژکاران هەمو پەندو حیکمەتەکانیان لە یەك ڕستەدا کۆکردەوە، کە پادشا زۆری بە دڵ بوو!

(هیچ شتێك بە خۆڕایی دەست ناکەوێت)!

پادشا پێی گوتن: دەستتان خۆش ئەمە ئەو پەندو حیکمەتەیە، کە پێویستە بۆ نەوەکانمانی بە جێبهێڵین!!

**لەم چیرۆکەوە فێر دەبین:**

١- ژیان قوتابخانەیەکی گەورەیەو دەتوانین وانەی زۆر جوانی لێوە فێر ببین، بەڵام قوتابخانەی ژیان پێچەوانەی قوتابخانەکانی ترە، چونکە وەکو زانایەك دەڵێت: لە قوتابخانەدا وانەکان دەخوێنین پاشان تاقیکردنەوە ئەنجام دەدەین، بەڵام لە قوتابخانەی ژیاندا دەبێت تاقیکردنەوەکان ئەنجام بدەین، پاشان وانەکان فێر دەبین، ئەویش پێی دەگوترێت: (ئەزموون).

٢- زۆر پێویستە ئەزموونەکانمان بگوازینەوە بۆ نەوەکانمان، تا سوودی لێ وەربگرن‌و لە پەندو ئامۆژگارییەکانمان بێ بەش نەبن.

٣- ئەرکێکی نەتەوەییە کە پارێزگاری لە کلتوری باب‌و باپیرانمان بکەین‌و وەکو گەنجینەیەکی زۆر بە نرخ تەماشای بکەین، چونکە بەرهەمی سەدان ساڵ ئەزموون‌و تاقیکردنەوەی ئەوانە.

خۆزگە نەوەکانی ئەم سەردەمە تەماشایەکی پەندەکانی پیرەمێردیان دەکردو بە چاوی خۆیان ئەو هەموو پەندو ئامۆژگاریانەیان دەخوێندەوە کە بە نرخترە لە دووڕو گەوهەر، بە داخەوە لێی بێ بەشن.

٤- گرنگە پەندو ئامۆژگارییەکانمان کورت بکەینەوەو بە شێوەیەکی ئاسان پێشکەشی نەوەکانی دوای خۆمانی بکەین، تا بتوانن کورد گوتەنی: وەکو گوارە لە گوێی بکەن‌و هەمیشە لە یادیان بێت!

٥- کۆکردنەوەی هەموو پەندو ئامۆژگارییەکان لە یەك وتەدا، کە بریتییە لە (هیچ شتێك بە خۆڕایی پەیدا نابێت)، هەڵبژاردنێکی جوان‌و دانایی پادشاو ڕاوێژکارانی دەردەخات.

٦- کەواتە دەبێت هەموومان ئەوە بزانین کە گەیشتن بە هەر کارێك کە دەمانەوێت ئەنجامی بدەین ماندووبوونی دەوێت‌و هیچ دەستکەوتێك بە خۆڕایی دەست نەکەوتووە، سەرکەوتن‌و پێشکەوتنی نەتەوەکان ماندووبوون‌و هەوڵدان‌و قوربانیدانی زۆری لە پێناودا دراوە.

٧- ئەگەر بمانەوێت ئامانجەکانمان جێبەجێ بکەین، دەبێت هەمیشە ئەم پەندەمان لە خەیاڵ بێت، (هیچ شتێك بە خۆڕایی پەیدا نابێت).

بەشی دووەم

ئا: هەڵگورد مەسعود شاکر

# سەرکردایەتی

**پێنجەم: گرنگی سەرکردایەتی:**

پێویستە لەسەر کۆمەڵگای مرۆڤایەتی خۆی خۆی بەڕێوەببات، ئەویش لە ڕێگای دیاریکردنی سەرکردە بە پێی ئەو ژینگە سروشتییەی کە کۆمەڵەکان هەیانە بۆ ئەوەی ستەمو ئاشوب سەر هەڵنەدات لە نێو تاکەکانو یەک هەڵوێستیو یەکگرتوویی بهێنێتە کایەوە لە کاتی تەنگەژەکان، ئەوەتا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) دەفەرموویت: (ئەگەر سێ کەس بە یەکەوە چوون بۆ گەشتێك، با یەکێکیان ببێتە سەرکردەو بڕیاردەری دووانەکەی تر)، ئەگەر دوو کەس پێویستیان بە سەرکردە بێت، ئاخۆ دەبێ سەرکردە چەند گرنگ بێت بۆ نەتەوەیەك، بەڵام سەرکردەیەك کە بتوانێت ئەو بەرپرسیارییە گرنگە لە ئەستۆ بگرێتو شایەنی ئەو ئەرکە بێت.

پێویستە لەسەر کۆمەڵگاو ڕێکخراوەکان خۆیان بگونجێنن لەگەڵ سەرکردەو بەڕێوەبەرەکان، (چونکە کۆمەڵگای بێ سەرکردە تووشی شێوانو بێ سەروبەری دەبێتو سەرکەوتوو نابن لە هیچ کارێکدا».

لێرەدا بۆ زیاتر خستنەڕووی گرنگی سەرکردە، یاخود سەرکردایەتی کردن بە چەند خاڵێك باسی لێوە دەکەین:

* سەرکردە زۆر گرنگو پێویستە بۆ ڕێکخستنی ژیان، بۆ هێنانە کایەی دادپەروەری کۆمەڵایەتی بۆ ئەوەی گەورە بچووك نەخوات.

* گرنگی سەرکردایەتی کردن لەوەدایە کە بریتییە لە هۆکاری بە یەکبەستنەوەی هێزو تواناکان بە شێوەیەکی ڕێكوپێك، کە هێزی کارکەران لەگەڵ پلانو نەخشەکانی سەرکردە دوارۆژێکی پڕ هیوا دەهێنێتە دی.

* پشتگیری کردنی ڕەوشتی باشو کەمکردنەوەی کەمو کورییەکان، چونکە سەرکردە وەك کاپتنی کەشتی وایە.

* دانانی ستراتیژێکی ڕوونو ئاشکرا لە جوڵاندنی تواناکانو هاندانیان بەرەو ئامانجەکان.

* زنجیرەی پێکەوە بەستنە لە نێوان کرێکارانو نەخشەی ڕێکخراو.

* سەرکردە ئەو (کارێزما) سمبوڵەیە کە هەموو نەخشەو پلانو بەرنامەکانی ڕێکخراوی تێدا کۆبووەتەوە.

* هێزی چاکەخوازی گەشە پێدەداتو کەسانی خراپو نالەباریش دەکاتەوە لە سنووری دەسەڵاتەکەی.

* گەشەپێدانی تواناکانو مەشق پێکردنی کرێکارانو چاودێریکردنی کەسەکان بە مەبەستی باشترکردنی کارەکان لە ڕووی شێوازەوە.

* کۆنترۆڵ کردنی کێشەکانی کارکردنو پلاندانان بۆ چارەسەرکردنیان.

* گێڕانەوەی هاوسەنگی بۆ ژیان.

**شەشەم: سەرچاوەکانی سەرکردایەتی:**

سەرکردایەتیکردن پشت دەبەستێت بە بوونی کەسێکی کارگێڕی لە پێگەی سەرکردایەتی کردندا، کە بەو هۆیەوە بتوانێت کاریگەری هەبێت لەسەر کۆمەڵە کەسێك، ئەوانیش هەست بە تواناو لێهاتوویی ئەو سەرکردەیە بکەن.

هێزو شارەزایی زۆر پێویستە بۆ

کایگەر بوون بەسەر هەستی تاکەکان، هێزی کاریگەریش لە چەندین سەرچاوەوە هەڵدەقوڵێت و لە کاتی کاریگەربوونی کەسە شوێنکەوتووەکانی سەرکردە، ئەو هێزەش لەو بارودۆخو سەنتەرەوە دێت کە ئەو کەسەی پۆستی سەرکردایەتی پێدراوەو وەرگرتووە لە سۆنگەی ئەو دەسەڵاتو مافانە دێت کە وەریگرتووە لە هێزی کاریگەری کەسایەتی خۆیو ئەو جیاوازییەی کە ئەو جیا دەکاتەوە لە کەسانی تری ئاسایی.

هێزو شێوازەکانی کاریگەربوون **کە سەرکردەکان بە ڕێگای جیاواز دەریدەبڕن بەم شێوەیە:**

**١- هێزی شەرعیو یاسایی:** ئەو هێزەش دەرئەنجامی کاریگەری شوێنی کەسی سەرکردەیە لە هەیکەلی ڕێکخراو، ئەو هێزەش ڕێکخراو دانی پێدا دەنێت.

**٢- هێزی پاداشتکردن (المكافأه):** ئەو هێزەش پشت دەبەستێت بە پاداشتکردنی کەسانی تر، وەك مووچەو پلە بەرزکردنەوەو پاداشتکردنو شتی تر، هەروەها ئەو پشت دەبەستێت بە زانستی کارگێڕیو بەڕێوەبردنو دیاریکردنی ئەو کەسانەی کە شایەنی پاداشتکردنن.

**٣- هێزی هەڕەشە لێکردنو ناچارکردن:** ئەو هێزە لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە پشت بە سزادانی کەسانی تر دەبەستێت، وەك سزای سەرنجڕاکێشان، ئەمەش سەرکردە خۆی ئەو کەسانە دیاری دەکات کە شایەنی سزادانن.

**٤- هێزی شارەزایی:** ئەمەش ئەو هێزەیە کە پشت دەبەستێت بە شارەزاییو لێهاتوویی لەسەر ئەو ئەزموونەی کە پێیدا تێپەڕیوە، واتە دەبێت سەرکردە باگراوندێکی ڕۆشنبیریو زانیاری پێویستی هەبێت بۆ سەرکردایەتیکردنی شوێنکەوتووەکانی، ئەمەش هێزو توانای سەرکردە زیاتر دەکات لە هەنگاونانو کاریگەربوون لەسەر کەسەکان، هەروەها پشت دەبەستێت بە بەڕێوەبردنی بەردەستەکانی کە سەرکردە زانیارییەکی تایبەتو سوود بەخشی هەیە بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییەکان.

**٥- هێزی پەیوەندیو سەرسوڕمان:** ئەو هێزەیە کە لە ڕێگای پەیوەندیو سەرسوڕمانەوە دێت لەگەڵ بەستنەوەی پەیوەندییەکان، ئەوەش پشت دەبەستێت بە ویستی کەسانی تر بۆ شوێنکەوتنو چاولێکردنی سەرکردە بەبێ ئەوەی هیچ یاسایەك، یان لایەنێکی دیاریکراو ناچاریان بکات، ئەم هێزەش لە خودی کەسایەتی سەرکردە هەڵدەقوڵێت.

سەرچاوەکانی دەسەڵاتیش دەکرێت بڵێین دوو جۆرن:

**جۆری یەکەم:** سێ سەرچاوەی هێز لە خۆدەگرێت: هێزی شەرعیو یاسایی، هێزی پاداشتکردن، هێزی هەڕەشە لێکردنو ناچارکردن، ئەمانە سەرچاوەو تایبەتمەندی کەسین.

**جۆری دووەم:** دوو سەرچاوەی هێز لە خۆ دەگرێت: هێزی شارەزایی، هێزی پەیوەندیو سەرسوڕمان، ئەم دوو هێزەش بەوە پێناسە دەکرێن کە بریتیین لە تایبەتمەندیو پاڵنەری کەسین.

یەکێك لە سیفەتە سەرکەوتووەکانی کەسی سەرکردە بەکارهێنانی هەندێ بنەماو هونەر لەسەر شوێنکەوتووەکانی، هەر یەك لەو بنەمایانە لە سیاسەتی سەرکردەکان شیکردنەوەی سەرکردەییانەی خۆی هەیە کە ڕۆڵیان هەیە لە بڕیارو هەنگاوەکانی کەسی سەرکردە لە پێشخستنو گەیشتن بە ئامانجەکانو جێبەجێکردنی نەخشەو پلانە داڕێژراوەکان.

**حەوتەم:شیکردنەوەی خەسڵەتەکانی سەرکردە:**

تا ئێستا خەسڵەتێکی دیاریکراو نییە لە کەسایەتی سەرکردەکان، هەر بۆیە تا ئێستا زانایانی بواری بەڕێوەبردن مشتومڕیانە لەسەر ئەو چەمکە، چونکە هەندێکیان دەڵێن: ناکرێت سەرکردە خەسڵەتەکانی جێگیر بێت، بەڵام لە بەرامبەردا هەندێکی تر دەڵێن: نەخێر، بابەتەکە لەسەر بارودۆخو هەڵوێستو بڕیارەکان دەوەستێت، بۆیە ئەگەر بۆچوونی هەر شارەزایەك وەربگریت لەسەر خەسڵەتەکانی سەرکردە بیروبۆچوونی جیاوازی هەیە لەم بارەیەوە، بەڵام لە دواجاردا کۆدەنگییەك هەیە لەسەر هەندێ خەسڵەتی گشتی کە دەبێت لەو کەسانەدا هەبن کە پۆستی سەرکردایەتی بەڕێوە دەبەن کە بریتیین لە هەر یەك لە (پلاندانان، هاندان، ڕاستگۆیی، متمانە بە خود، چاودێری خود، ڕۆشنبیری، خاوەنی سەرنجی تیژ، زیرەکی کۆمەڵایەتی، پابەندی ڕەوشتی)، لەگەڵ شیکردنەوەی یەك بە یەکی ئەو خەسڵەتانە.

**بنەماکانی شیکردنەوەی خەسڵەتی سەرکردایەتی:**

**پلاندانان:** لێکۆڵینەوەکان دەریانخستووە سەرکردەکان لە (٨٠٪)ی کاتیان لە پلاندانانندا بەسەر دەبەن، لە (٢٠٪)ەکەی تر لە جێبەجێکردنداو هیچ شتێك بۆ بەخت جێ ناهێڵن.

هاندان: ئارەزوویەکی ناوەکییە لە لای سەرکردە بۆ بەکارهێنانی هێزو لێهاتووییەکانی، بۆ بە جوڵەخستنو وروژاندنی خەڵك تا بە ئامانجەکانیان بگەن، هەروەها بە کارهێنانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیو مرۆییەکان. سەرکردە توانای ئەوەی هەیە گیانی دڵگەرمیو هاندان لە ناخی ئەندامەکانی بچێنێت بۆ بەگەڕخستنی تواناکانیان.

**ڕاستگۆیی:** ڕاستگۆیی لە گوفتارو کردارەکان متمانەی بەهێز لە لای شوێنکەوتووەکان دروست دەکات. کۆمەڵێك توێژینەوە ئاماژەیان بەوە داوە کە گرنگترین سیفەت لە لای شوێنکەوتەکانی بە دوایدا دەگەڕێن لە سەرکردە بریتییە لە ڕاستگۆیی.

**متمانە بە خود:** متمانەی سەرکردە بە تواناو لێهاتوویی خۆیو گەیشتنی بە ئامانجەکان، کە ئەمە وای لێدەکات بە جۆرێك هەڵسوکەوت بکات شوێن کەوتووەکانی پێ ڕازی بێت.

**چاودێری خود:** سەرکردەی ئەکتیڤو چالاك خاوەنی چاودێری خۆیەتیو هەست بە هەموو گۆڕانکارییەك دەکات کە لە دەوروبەری ڕوودەدات، تەنانەت ئەگەر زۆر دووریش بێت. توێژینەوەیەك کە لە گۆڤاری (پراکتیکی) بڵاوکراوەتەوە لە ساڵی (١٩٩١) ئاماژە بەوە دەکات گەر کەسێك ئەم سیفەتەی تێدا بێت، هەلی دەرکەوتنی وەك سەرکردە باشتر بۆ ڕێك دەکەوێت، ئەگەر بەشێوەیەکی فەرمیش نەبێت.

**ڕۆشنبیری:** سەرکردەی ڕۆشنبیر زانیاری بە لێشاوی هەیە بێجگە لە پلەی زانستی بەرز، بەردەوام گەشە بە تواناکانی خۆی دەدات لە ڕێی خوێندنەوەو خولی ڕاهێنانەوە.

**خاوەنی سەرنجی تیژ:** ئەو شتانە دەبینێت کە ئەوانی تر نایان بینن، ڕەخنە قبوڵ دەکات، ئەو دەتوانێت نەخشەی داهێنەرانە دابنێت، دڵگەرمە لە بەرامبەر بیرۆکەی تازەو داهێنەرانە کە لە ناخی ئەوانی تردا دەچێنێت.

**زیرەکی کۆمەڵایەتی:** لێزانە لە پەیوەندی گرتن لەگەڵ کەسەکان، دەزانێت چۆن دەدوێتو پەیامی خۆی بە بەرامبەرەکانی دەگەیەنێت، گوێگرێکی باشو گفتوگۆکارێکی قەشەنگیشە.

**پابەندی ڕەوشتی:** ئەم خەسڵەتە لە گرنگترینو بەهێزترین خەسڵەتەکانی سەرکردەی سەرکەوتووە، نەخواسە لە دیدگای ئیسلامیشدا، چونکە سەرکردە ناتوانێت دەسکەوتی دنیاییو خێرا لەسەر حیسابی بیروباوەڕو بە هاکانی بە دەست بێنێت.

بەشی یەک

# چوار خاڵی سەرەکی بۆ هەڵسوکەوتکردنی بەڕێوەبەر، لە گەڵ فەرمانبەراندا

ئا: ئیحسان شەریف ساڵح

بە گوێرەی هەڵسوکەتکردنی بەڕێوەبەر لەگەڵ فەرمانبەراندا، سێ جۆر بەڕێوەبەرمان هەیە:

**یەکەم: ئەو بەڕێوەبەرانەی کە بە توندی لەگەڵ فەرمانبەراندا هەڵسوکەوت دەکەنو تەنیا بیر لە ئەنجامی کارەکە دەکەنەوە.**

ئەم جۆرە بەڕێوەبەرانە لە لایەن دەسەڵاتی سەرەوەی خۆی، بە بەڕێوەبەری سەرکەوتوو دادەنرێن.. بەڵام لە لایان فەرمانبەرانەوە بە پێچەوانەیە.

**دووەم: ئەو بەڕێوەبەرەی کە بە شێوەیەکی نەرمونیان لە گەڵ فەرمانبەراندا ڕەفتار دەکاتو خۆی بە بەڕێوەبەری ئازادیخواز دەزانێت.**

ئەم جۆرە بەڕێوەبەرانەش لە لایەن فەرمانبەرانەوە بە بەڕێوەبەرانی خۆشەویستو سەرکەوتوو دادەنرێن.. بەڵام لە لایەن دەسەڵاتی سەرەوە بە بەڕێوەبەرێکی نەزان دادەنرێت، کە تا ڕادەیەکیش دەتوانین بڵێین وایە.. چونکە ئەم بەڕێوەبەرانە بیر لە ئەنجام ناکەنەوە.

**سێیەم: ئەو بەڕێوەبەرانەی کە گرنگی بە فەرمانبەرو بە ئەنجامی کارەکە دەدەن.**

دەتوانین بڵێین ئەم جۆرە بەڕێوەبەرانە بەڕێوەبەری سەرکەوتوون. بۆئەوەی هەر بەڕێوەبەرێکیش بتوانێت لەم جۆرە بەڕێوەبەرانە بێت کە ئەنجامی باشی لە کارەکاندا هەبێت.. هەروەها فەرمانبەرانیش لێی ڕازی بنو بەڕێوەبەری خۆیان خۆش بوێت.. دەبێت ڕەچاوی ئەم چوار خاڵەی خوارەوە بکات:-

**خاڵی یەکەم: ئامانج دیاریکردن بۆ فەرمانبەران:** کاتێک فەرمانبەر هەڵدەستێت بە ئەنجامدانی کارێکی پێویست.. با ئامانجی کارەکەی بزانێت. لەبەرئەوە ئەرکی سەرشانی بەڕێوەبەرە.. ئامانج بۆ فەرمانبەرەکانی دیاری بکات. واتە کاتێک فەرمانبەر هەڵدەستێت بە ئەنجامدانی کارێك، ئامانجی بۆ دیاری بکات. زۆر جار ئەوە دێتە پێش.. ئەگەر لە فەرمانبەرێك بپرسیت: ئامانج لەو کارەی دەیکەیت، چییە؟.. هەروەها لە بەڕێوەبەرەکەشی بپرسیت.. ئەوا دوو وەڵامی جیاوازت دەست دەکەوێت. ئەوەش لەبەرئەوەیە کە بەڕێوەبەر ئامانجی بۆ فەرمانبەر دیاری نەکردووەو فەرمانبەریش نازانێت چ ئامانجێکی هەیە.

لە زۆربەی فەرمانگەکاندا دەبینین.. فەرمانبەران بۆ جێبەجێکردنی کارەکانیان بە ویستی خۆیان ئاواتەخوازی کار ناکەن.. چونکە ئامانجی ئەو کارەی دەیکەن، نازانن. بۆ نموونە کاتێك کەسێك یاری بۆڵینگ دەکات، کاتێك هەموو خاڵەکانی یاری بە دەست دەهێنێت، زۆر خوشحاڵ دەبێت.. چونکە دەزانێت گەیشتووەتە ئەو ئامانجەی کە لە هزریدا بوو.. لەوانەیە چەندان جاری دیکەش، ئەم یارییە دووبارە بکاتەوەو بێ ماندوو بوونو بە ئاواتەخوازییەوە یاری بکات، بەڵام زۆر جار دەبێت فەرمانبەر کارەکەی خۆی بە تەواوی ئەنجام بدات بێئەوەی خۆی بزانێت کارەکەی بە تەواوی ئەنجام داوە، بۆیە زۆر خوشحاڵ نابێتو دووبارە بە ئاواتەخوازی کار ناکات.. چونکە لە سەرەتادا ئامانجی بۆ دیاری نەکراوە، هەروەك ئەوەی کەسێك یاری بۆڵینگ بکاتو لە کاتی یاریکردندا پەردەیەکی لە پێش دابنرێتو نەزانێت چەند خاڵی بەدەست هێناوە، کاتێك کەسێك لێی دەپرسێت چەند خاڵت بە دەست هێناوە؟ دەڵێت: دەنگی هات وا بزانم باش

بووم.. بەڵام نازانم چەند خاڵم بەدەست هێناوە. ئەمەش وەك ئەو فەرمانبەرەیە كە نازانێت ئامانجی چییە لەو كارەی كە ئەنجامی دەدات. بۆیە ئەگەر یاریزانەكەش نەزانێت چەند خاڵی بەدەست هێناوە بۆ جاری دووەم یاری ناكات.

هەروەها پێویستە بەڕێوەبەر لەگەڵ فەرمانبەردا ڕێكبكەوێت لەسەر ئامانجی كارەكەو پێویستیشە لە سەریان بگەڕێن بە دوای هەڵسوكەوتی گونجاودا كە دەكرێت بە دەر بخرێت لە لایەن فەرمانبەرەوە، دوای ئەوەی ئامانج دیاری كرا، پێویستە لە سەر كاغەزێك ڕوون بكرێتەوە، بەڵام نابێت ئەم نووسراوە لە ٢٥٠ وشە زیاتر بێت.. پاشان لە سەر كاغەزەكە ڕوون بكرێتەوە، پێویستە دیسان هەموو ئامانجەكان بخوێندرێنەوەو بەڕێوەبەرو فەرمانبەر لەسەر باشترین ئامانج ڕێكبكەون، دەبێت بەڕێوەبەر بزانێت.. ئایا هەڵسوكەوتو ڕەوشتی فەرمانبەر لەگەڵ ئامانجی ئەو كارەی دەیكات دەگونجێت.

ئەگەر فەرمانبەر كەسێكی زیرەكو شارەزا بێت پێوست ناكات، بەڕێوەبەر ئامانجی بۆ دیاری بكات.

پێویستە بەڕێوەبەر فەرمانبەر تێبگەیەنێت كە چ چاوەڕوانییەكی لێی هەیە. هەروەها پێوستە لە سەر بەڕێوەبەر، هەفتەی ڕۆژێك، یان لە دوو هەفتەدا ڕۆژێك تایبەت بكات بۆ كۆبوونەوە، لە گەڵ گشت فەرمانبەراندا.. بۆ ئەوەی لەم كۆبوونەوەدا زیاتر باس لە ئامانجەكانیان بكەن، هەروەها بەڕێوەبەر ئاگادار بێت لەو كارانەی فەرمانبەران ئەنجامی دەدەنو لەو كێشانەی هەیانەو دیاریكردنی چارەسەر بۆ كێشەكان.

**خاڵی دووەم: پێدا هەڵگوتنو هاندان:**

دوای دیاریكردنی ئامانج بۆ فەرمانبەران، دەبێت پەیوەندییەكی نزیك هەبێت لە نێوان بەڕێوەبەرو فەرمانبەردا.

لە كاتی دەستبەكاربوونی فەرمانبەر بۆ گەیشتن بە ئامانج، دەبێت فەرمانبەر زوو زوو سەردانی بكرێتو لە ژێر چاودێریدا بێتو داوا لە فەرمانبەر بكرێت، هەندێك زانیاری سەبارەت بە پێشكەوتنەكانی لە كارەكەیدا دروست بكاتو بۆی بنێرێت. ئەمەش بۆ ئەوەیە كە وا لە فەرمانبەر بكرێت كارەكەی بە دروستی ئەنجام بدات. دوای ئەوەی كە فەرمانبەر كارەكانی جێبەجێ دەكات.. لە سەر بەڕێوەبەر پێویستە دەستخۆشی لێ بكاتو هانی بداتو سوپاسی بكات.. تا فەرمانبەر بزانێت كارەكەی خۆی بە دروستی ئەنجام داوە، بشزانێت بەڕێوەبەر ئاگای لێیەتی. دەبێت بەڕێوەبەر بە فەرمانبەر بڵێت.. چ كارێكی بە دروستی ئەنجام داوەو لە كام كارەشدا سەركەوتوو نەبووە. هەروەها دەبێت بە فەرمانبەر بڵێت: بەو كارەی كردوویەتی چەند خۆشحاڵەو ئەوكارەی كردوویەتی چەندە بە سوودە بۆ فەرمانگەكەو فەرمانبەرانی دیكە. لە خاڵی پێشوو باسی ئەوەمان كرد.. ئەگەر كەسێك یاری بۆڵینگ بكاتو پەردەیەك لە پێشی دابنرێت كە نەزانێت چەند خاڵی بە دەست هێناوەو كەسەكەش لە بەرئەوەی نازانێت چەند خاڵی بە دەست هێناوە، لە سەر یاری بەردەوام نابێت.. بەڵام ئەگەر لەو دیوی پەردە كەسێك دابنرێتو لە كاتی یاریكردندا، ئەو كەسە بە یاریزانەكە بڵێت.. چەند خاڵی بەدەست هێناوە، ئەوا یاریزانەكە لە سەر یارییەكە بەردەوام دەبێت.. بە ئاواتەخوازیو دەزانێت چەند خاڵی بەدەست هێناوە، بەڕێوەبەریش دەتوانێت ڕۆڵی ئەو كەسە ببینێت كە لەو دیوی پەردە ڕاوستاوەو ئەنجامی یارییەكە بە یاریزانەكە دەڵێت.. بەڕێوەبەر دەتوانێت فەرمانبەر ئاگادار بكاتەوە لەو كارەی كردوویەتیو هانی بدات بۆ بەردەوام بوونو سەركەوتن لە كارەكەیدا.

دوای ئەوەی بەڕێوەبەر بینی فەرمانبەر كارەكەی بە باشی ئەنجام دا.. دەبێت چەند چركەیەك بێدەنگ بێتو دوایی پێیدا هەڵ بڵێتو هانی بدات تا فەرمانبەر بزانێت.. بەڕێوەبەر چەند بەو كارەی كردوویەتی خوشحاڵە. كاتێك كە فەرمانبەر هەموو كارەكەی بە تەواوی ئەنجام نەدا.. بەڵام زۆربەی كارەكەی بە باشی ئەنجام دا.. دەبێت بەڕێوەبەر هانی فەرمانبەر بدات تاكو هەموو كارەكەی وەك ئەو كارەی كە دروست ئەنجامی داوە جێبەجێ بكات.

دەتوانین بڵێین كە فەرمانبەریش ئەگەر دەستخۆشی لێ بكرێت و هانی بدرێت لە سەر ئەنجامدانی كارەكەی لە لایەن بەڕێوەبەر بۆ ئەوەی كە دەستخۆشی لە بەڕێوەبەر وەربگرێت وا كار دەكات كە بەڕێوەبەرەكەی پێی خۆشە بۆ ئەوەی بتوانێت دەستخۆشی لە بەڕێوەبەرەكە وەربگرێتو پاشان خۆی وەها ڕادێت كە هەر خۆی بە ئاواتە خوازی بۆ خۆی كار دەكات.

بەڵام پێداهەڵگوتن لە بۆ ئەو فەرمانبەرانەی كە لە سەر ئەنجامدانی كاری خۆیان ئاواتە خوازن، بە ویستی خۆیان كار دەكەن پێویست ناكات.

# خێر له ژماره

# دایه

م. هاژه شێروانی

بابزانین چ خێرێك لە ژمارە (٩)دا هەیە، ئەمە پرۆژەیەكە كە تیایدا دەبێت هەڵسی بە هەڵبژاردنی (٣) كەس لە ئەندامانی خێزانەكەت، یا دراوسێكانت، یا هاوڕێكانت، یاخود ناسیاوەكانت، لەوانەیە هاوكارەكانی كاریش بگرێتەوە، پێویستە لەسەر ئەم سێ كەسە كە هەڵسن بە داواكردنی سێ كار لە تۆ كە بۆیان ڕاببەڕێنیت، لە ماوەی مانگێكداو بە بێ هیچ بەرامبەرێك، وەكو پرۆژەیەكی خێرخوازیو خۆبەخشی كە هیچ سوودو قازانجێكی بۆ تۆ نەبێت، تەنها بۆ سووككردنی باری سەرشانی ئەم سێ كەسە بێت، لە هەمان كاتیشدا دەرفەتێكی باشە بۆ تۆ تا كاتەكانت ڕێكبخەیتەوەو بەرامبەر خودی خۆت ببیتەوە بۆ ئەنجامدانو بە جێهێنانی كارەكان لە ماوەیەكی دیاریكراودا، ئەمەی خوارەوەش پلانی پێشنیار كراوە بۆت لە ماوەی ئەو مانگەدا:

**هەفتەی یەكەم:** هەڵبژاردنی سێ كەسو ئەو پرۆژەیان پێشكەش بكەو پێداویستییەكانیان بزانە.

**هەفتەی دووەمو سێیەم:** هەڵسە بە جێبەجێكردنی داواكارییەكانیان بە هەموو هەوڵو كۆششێكت.

**هەفتەی چوارەم:** بە كتوپڕی مژدەی تەواوبونی خزمەتەكانیان پێبدەو بە بۆنەی ئەم سەركەوتنەش ئاهەنگێكی بچكۆلانە بگێڕن، دڵنیابە كە بەختەوەر دەبیت كاتێك دەبینی ڕەزامەندی لە چاوەكانیان دەخوێندرێتەوە، كە بە هیچ نرخێك ناخەملێنرێت.

# لێهاتووییەکانی مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکدا

بەشی چوارەم

ن: د. طارق السویدان
و: دڵشاد محەممەد

## چوارەم: بونیادنانی پەیوەندییە مرۆییەکان:

لە ژمارەی ڕابردوودا باسمان لە لێهاتوویی (هاندان)کرد، ئەمجارەش بە پشتیوانی خودا قسە لەسەر لێهاتوویی چوارەم دەکەین، ئەویش لێهاتوویی (بونیادنانی پەیوەندییە مرۆییەکان)ە، کە لە ڕێگەی ئەم خاڵانەی خوارەوە دەستەبەر دەبێت:

### ١- بزەو زەردەخەنەی سیحرئامێز:

زەردەخەنەو ڕووخۆشی هیچی تێناچێتو بەدرێژایی تەمەنیش دەمێنێتەوە، زەردەخەنەیەك كە بەڵگەو ئاماژەیە بۆ دڵێکی پڕ لە خۆشەویستیو مەحەببەت بەرامبەر کەسانی ترو ناوەندی سەرنجڕاکێشانی دڵەکان پێکدەهێنێت..

### ٢- دانان بە هەڵەو ناسینی کەموکورتییەکان:

دانان بە هەڵەو ناسینی کەموکورتییەکان وێنەیەکی جوانو نایابە لە دروستکردنی پەیوەندییەکاندا، بەڵگەیە لەسەر جوامێری خۆبەکەمزانی سەرکردەو باوەڕبوونی بەوەی کاروبارەکان هەرچەندێك سەرکەوتوو، بەرزو نایاب بن، هێشتا کامڵو تەواو، یاخود نموونەیی نین.

هەروەها ئەو هەڵوێستو تێڕوانینە جوانە دوورمان دەخاتەوە لە کەللە ڕەقیو فیرسچمەییو پێداگیری لەسەر ڕای خۆی بە ڕاستو ناڕاست، گوێنەگرتن لە ئامۆژگاریو ڕاوبۆچوونی کەسانی دی.

### ٣- کۆنترۆڵکردنی دەروونو ڕەفتار:

گومانی تێدا نییە کە هێوریو لەسەرخۆییو کۆنترۆڵکردنی دەروون سوودگەلێکی زۆری هەیە بۆ ئەو کەسەی پێیانەوە پابەند دەبێت، هەروەك چۆن لە خەسڵەتەکانی سەرکردەی سەرکەوتوون.

هێمنیو کۆنترۆڵکردنی ڕەفتارو ئاکارەکان، فەراهەمهێنی کەشێکی پڕ لە ئارامیو ئاسوودەییەو ڕەوینەوەی ترسو دڵەڕاوکێیە، بە تایبەتی لە کاتی قەیرانو مەترسییەکاندا. هەروەها کۆنترۆڵکردنی هەڵچوونەکانو پارێزگاریکردن لە هێوریو لەسەرخۆیی، وا لە مرۆڤ دەکات بە شێوەیەکی ڕاستو ڕەوان بیربکاتەوەو بڕیاری گونجاوو دروست دەربکات، کە دووربێت لە کاردانەوەو سۆزو هەڵچوونی دەروونی.

### ٤- بانکی سۆزو عاتیفە:

حسابی بانکی لە بانکی سۆزو عاتیفەدا پەیوەندییەکی مەودا درێژت بۆ زامنو دەستەبەردەکات.. لە پەیوەندییەکانتدا بەو شێوەیە بیربکەرەوە کە هەر وشەو قسەیەکی توندو ڕەق ڕاکێشانو کەمکردنەوەی بڕی پشتیوانەیە (الرصید)، هەر هەڵەیەك بەرامبەر کەسێك دەیکەیت کە پەیوەندییت لەگەڵیدا هەیە ڕاکێشانێکە لە ڕەسیدی بانك، هەروەك چۆن وشەی جوانو قسەی خۆش زیادکردنی بڕی پشتیوانەیە، هەرچەندێکیش پشتیوانەت زیاد بێت، هێندە زیاتر دەتوانیت پشت بە کەسەکان ببەستیت.

لێرەدا واتاگەلێك هەن کە پشتیوانە زیاد دەکەن، واتاگەلێکی دیکەش هەن لە پشتیوانە ڕادەکێشنو کەمیدەکەنەوە، بۆیە وریابەو ئاگاداری گوفتارو کردارەکانت بە، سووربە لەسەر ئازارنەدانو بریندارنەکرنی هەستو شعوری کەسانی دەوروبەرت.

# پێم بڵێ: بەڕێوەبەرەکەت کێیە؟
# پێت دەڵێم: چۆن هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکەیت!

و: ئەسکەندەر ڕەحیم

بەڕێوەبەرەکان بە گوێرەی کارتێکەرە دەروونی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و شارستانیەتییەکان جیاوازن.. گومانیش لەوەدا نییە، سەرکەوتوو بوون لە دەستنیشانکردنی نیشانە گشتی و تایبەتییەکانی بەڕێوەبەرەکەت.. لە دیاریکردنی ئەو هۆکارو ڕێو شوێنە کاریگەرانەیە کە کار پەیوەندی کردنی نێوانتان دەکەن.. هەروەها بەشێوەیەکی باش یارمەتیتان دەدەن.

لێرەدا چوار چەشنی بەڕێوەبەرو شێوازەکانی مامەڵەکردن لەگەڵیاندا دەخەینە ڕوو:

**١- بەڕێوەبەری ڕاستیخواز:**

بەڕێوەبەری ڕاستیخواز بە هێوری، جوامێری، ئارامگرتن، ڕاستی بینین، وردی، قاڵبوونەوە لە ئێستەدا، توانای بەڵگە هێنانەوەو پەیوەست بوون بەو ڕاستییانەی کە لە بارەی خۆیەوە، دەیانڵێت.. جیا دەکرێتەوە.

ئەم چەشنە بەڕێوەبەرە، بە پێی ئەزموونەکانی ڕابردووی، لەگەڵ کەسانی دیکەدا دەجووڵێتەوە.. لاوازی خەیاڵیش ڕەوشتێکی دیکەیەتی.. هەروەها وێنەی تەواوەتی باس و خواستەکە نابینێت.. زۆربەی کاتیشی لە وردەکارییەکاندا بە فیرۆ دەدات.

هەڵسوکەوتو پەیوەندیکردن لەگەڵ بەڕێوەبەری ڕاستیخوازدا.. ئەوە پێویست دەکات، لە خستنە ڕووی هەر بابەتێکدا، کە دەتەوێت لەگەڵ بەڕێوەبەرەکەتدا، لە بارەیەوە بدوێیت.. ورد بیتو کرداری ڕابردوو لە وتەکانتدا بە کار بهێنە. وەك: ئەم کارەمان بەو شێوەیەی ئەزموونەکان سەلماندوویانە، ڕامانپەڕاندووە. هەروەها پێویستە شتی نوێ هەڵبهێنجیتو باش لەو زانیارییانەی بە درێژی پێشکەشی دەکەیت، تێ بگەیت.

**٢- بەڕێوەبەری داهێنەر:**

بەڕێوەبەری داهێنەر خاوەنی خەیاڵێکی گەورەیەو زۆر بە خێرایی دەتوانێت لە بابەتێکەوە، بچێتە سەر بابەتێکی دیکە.. هەوای دڵی زوو دەگۆڕێتو لە جموجووڵیشدا گورج و گۆڵ و چالاکە، لە چارەسەرکردنی کێشەکانیشدا، پشت بە شێوازی هەڵگۆزین و لێخوێندنەوە دەبەستێت.

بەڕێوەبەری داهێنەر پێچەوانەی بەڕێوەبەری ڕاستیخوازە.. بە جۆرێك ئەم وەك بەڕێوەبەرەکەی پێشتر باسکرا، زۆر ئارەزووی مامەڵەکردنی لەگەڵ وردو درشتی بابەتەکاندا نییەو لە خستنە ڕووی زانیارییەکانیشدا زۆر ورد نییە.. هەروەها باروودۆخ زۆر ناخوێنێتەوەو پشت بە زانیاری ناتەواو دەبەستێت.

باشترین شێواز بۆ هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ئەم چەشنە بەڕێوەبەرەدا ئەوەیە.. بە تەواوەتی چاوت لەسەر هەڵوێستەکانو ئایندەو دەرفەتە ڕەخساوەکان بێت.. هەروەها لە کاردانەوەکانیشتدا زۆر خێرا بیت.. بە چەشنێك زۆر بە خێرایی لە بیرۆکەیەکەوە بچیتە سەر بیرۆکەیەکی دیکە.

**٣- بەڕێوەبەری نرخێنەر:**

بەڕێوەبەری نرخێنەر بڕیارەکان دەردەکاتو ڕاستییەکان دەنرخێنێت.. ئەویش بە گوێرەی چەند نەریتێکی تایبەتی کە خۆی بڕوای پێیان هەیە.. بێئەوەی لێی بکۆڵێتەوە بۆچوونی نوێ پەسەند دەکات.. توانای شیکردنەوەی ژیربێژییانەو تێڕوانینی هەمە لایەنەی کەمەو کەسەکانو بۆچوونەکانیان تێکەڵ دەکات.. کۆمەڵە شێوازێکی ناژیرانەش لە پێدانی ئەنجامەکاندا بە کار دەهێنێتو ڕەخنەش لە لێکدانەوەو شیکردنەوەی کەسانی دیکە دەگرێت.

بۆ هەڵسوکەوتو پەیوەندیکردن لەگەڵ بەڕێوەبەری نرخێنەردا.. پێویستە لەگەڵ هەستو نەستیدا بدوێیتو بۆ بنیاتنانی پەیوەندییەکی پتەو لە نێوانتاندا کار بکەیتو ئەوەشی دەیڵێت، بایەخ و پەرۆشی خۆتی بۆ دەرببڕیت.. هەروەها هەوڵ بدە بەو نەریتانەی بڕوای پێیانە ئاشنا ببیت.. تا بتوانیت لەگەڵیدا هەڵبکەیت.

**٤- بەڕێوەبەری لێکدەر:**

بە ڕادەیەکی زۆر بەرز بەڕێوەبەری لێکدەر ژیربێژی و پەیوەندی هۆو ئەنجام بەکاردەهێنێتو بۆخۆی کەسێکی سۆزدار نییەو لە ڕووبەڕووبوونەوەدا توانایەکی باشی هەیە.. بەڵام کارزانی لە وتووێژدا کەمەو زۆر جاریش لەو پەیوەندییانەی لەگەڵ کەسانی دیکەدا هەیەتی، تووشی گرفت دەبێت.

بۆ هەڵسوکەوت کردنیش لەگەڵ ئەم چەشنە بەڕێوەبەرەدا.. پێویستە ئارامت هەبێتو لە وتووێژەکانیشدا ژێری بخەیتە کارو سۆراغی هۆکارو ئەنجامەکانی بکەیت.. هەروەها ئەو پەیوەندییەی لە نێوان لایەنە جیاوازەکانی ئەو هەڵوێستە، یان ئەو گرفتەی لە ئارادایە، لێك بدەیتەوەو کاریش بکەیت بۆ لێکدانەوەی ئەو ڕێگەچارانەی لەبەر دەستدان.

ئەگەر بە چەشنی بەڕێوەبەرەکەتو شێوازی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵیدا ئاشنا بوویت.. ئەوا ئەمە دەبێتە مایەی بەختەوەری بەڕێوەبەرەکەتو لە لیستی کەسە نزیکەکانی داتدەنێت.. ئەگەر پلەبەرزکردنەوەش هەبێت.. ئەوا تۆ یەکەم پاڵێوراو دە بیت. چونکە زانیوتە بەڕێوەبەرەکەت کێیەو چۆنیش هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکەیت.

سەرچاوە:
النخبة الإدارية: ٦٦

وەهاب حەسیب محەممەد

# شیکردنەوەی چەند دەستەواژەیەکی کارگێڕی

ئازیزان ئەم جارەش چەند دەستەواژەیەکی کارگێڕی شیدەکەمەوە لەوانەی زۆرجار گوێبیستی دەبین، بە هیوای ئەوەی زیاتر لە واتاکانیان حاڵی بینو بتوانین لە شوێنی خۆیاندا بەکاریان بهێنینو لامان ئاڵۆز، یان تێکەڵ نەبن، لەگەڵ هاوشێوەکانیاندا.

* لایەنگیری (محسوبیة): جۆرێکە لە خۆشەویستی کەسانی نزیك لە خۆتو هەڵکشانیان بەسەر خەڵکانی بەتواناتر لە زانستو شارەزاییدا، لە دامەزراندن، یاخود ئیمتیاز پێدانیان، ماتریاڵیو مەعنەوی کە شایانی نین، یان بەرزکردنەوەی پلەی کارگێڕیو بەڕێوەبەرایەتیان بەسەر خەڵکانی شیاوتر لە خۆیان، ئامانجی ئەم کارانە زۆرکردنی داهاتو بەرزکردنەوەی ئاستی بژێویو بەهێزکردنی دەسەڵاتیانە (دەسەڵاتی کارگێڕی، ئەگەر پۆستەکە ڕامیاری بێت ئەوا بەهێزکردنی دەسەڵاتی سیاسی مەبەستە)، هەروەها شکۆمەندیان بە مەبەستی دەست بەسەراگرتنی دەوڵەتو دامەزراوەکانی، بەم شێوەیە بەرژوەندی تاکەکەسی زاڵ دەبێت بەسەر بەرژوەندی گشتیداو ئەو کات نزیکی لە کەسانی خاوەن دەسەڵات، بەڕێوبەرانی گشتی، تاکە پێوەری لێهاتویین بۆ دامەزراندنو بەرزکردنەوە، بەمجۆرە لایەنگیری دەبێت بە دیاردەو نەخۆشییەکی کۆمەڵایەتی کە دەبێتە هۆکاری بڵاوبونەوەی جۆرەها پەتای کۆمەڵایەتی کە ڕێگرە لە بەرەو پێشبردنی کۆمەڵگا، بە تایبەت لەو شوێنانەی ڕێزی خزمایەتی دەگیرێت.

لێرەدا بنەمای ڕاست بریتییە لە: دەستەبەرکردنی هەل (دەرفەتی کارکردنو دامەزراندنو بەرزکردنەوە....)، لەنێوانی کۆمەڵانی خەڵکدا بەشێوەیەکی یەکسان لە پێدانو بە جێگەیاندنی ئەرکەکانو بەخششەکانو یەکسانیان لەبەردەم یاسادا.

* لیژنە (اللجنة): ڕێکخستنێکی کارگێڕیی خاوەن ئەرکی تایبەتە، پسپۆرییەکی لە دروست کردنیدا دیاری دەکرێت. دەکرێت پێناسەی لیژنە بەم شێوەیە بکرێت، بریتییە لە کۆمەڵێك کە کەسانی چواردەوریان هەندێك ئەركو لێهاتوییان پێدەسپێرن، بەشێوەیەکی یاسایی لە لایەنی کارگێڕییەوە دەستنیشان دەکرێن، بۆ سەیرکردنی کێشەیەکی دیاریکراو و وەرگرتنی بڕیارو شیکردنەوەی، یان تەنها لێکۆڵینەوە دەربارەی ئاریشەکەو کۆکردنەوەی زانیاری پەیوەست بە کێشەکەوەو پێشکەشکردنی پێشنیارو ئامۆژگاری تایبەت بە کێشەکە، یاخود چاوگێڕانەوە بە ئاریشەکەدا بە شێوەی خول (دوري)، ئەندامانی لیژنە بۆ ماوەیەکی زۆر بەردەوام دەبن لە تەواوکردنی ئەرکەکانیان بۆ چارەسەری ئەو کێشانەی لە ڕێکخستنەکاندا ڕوو دەدەن. لیژنەکان دابەش دەبن بە جۆری جیاواز بە پێی ئەو دەسەڵاتەی دەیان درێتی، یان مەودای دروستبوونیان بەشێوەیەکی یاسایی، یاخود وادەی دروستبوونیان لە ڕووی کاتەوە، پێگەی ڕێکخستنو ئەرکەکانیان.

لە ڕووی دەسەڵاتەوە لیژنەکان دابەش دەبن بە سەر دووجۆر لیژنەدا لیژنەی جێبە جێکارو سەرپەرشتیار، لیژنەی جێبەجێکار دەسەڵاتی جێبەجێکاریان هەیەو مافی دەرکردنی بڕیاری پایە بەرزیان هەیە، هەرچی لیژنەی سەرپەرشتیارییە تەنها مافی پێشنیارو ئامۆژگاری هەیە. لە ڕوویی یاساییەوە لیژنە دابەش دەبێت بە سەر لیژنەی یاساییو نافەرمیدا، لیژنەی یاسایی، وەك بەشێك لە پێکهاتەی ڕێکخستن دروست دەکرێت، کاری دیاریکراوی پێدەسپێرێتو لێهاتوویی (صلاحية) دیاریکراو ئاشکرای دەدرێتە دەست، یاخود بۆی دادەبەزێنرێت، بەڵام ڕێکخستنی نافەرمی بەڕێوەبەری پسپۆر دروستی دەکات بۆ یارمەتیدانی

خۆی بێ ئەوەی جێگایەکی هەبێت لە نەخشەی ڕێکخستنی ڕێکخراوەکە، یان دامەزراوەکەدا. بەڵام لە ڕووی کاتەوە لیژنەکان دەبن بە لیژنەی کاتیو هەمیشەیی، لیژنەی کاتی بە تەواوکردنی ئەو ئەرکەی پێی سپێردراوە کۆتایی پێدێت، بەڵام لیژنەی هەمیشەیی کۆمەڵێك پسپۆڕێتی تایبەتی بۆ دەستنیشان دەکرێت. کارێکی سروشتییە کە لیژنەی هەمیشەیی لیژنەی نەخشەکێشانو بە دواداچوون بێت لە کەرتی گشتیدا. هەرچی ئەو لیژنانەی دروست دەکرێن بۆ کردنەوەی پێشانگایەك، یاخود دروستکردنی پەیکەری ڕێکخستنی دامەزراوەیەك ئەوە لیژنەی کاتییە بە تەواو کردنی کارەکانی تەمەنی ئەویش دەگات بە کۆتایی.

* تابلۆ کارگێڕییەکان (اللوائح الإدارية): تابلۆ بەو تەختەیە، یان کاغەزە زبرو ڕەقە گوتراوە کە وێنەیەکی سروشتی، یان دیمەنێکی مێژوویی لە سەر دەکێشرێت.

هەرچی تابلۆی کارگێڕییە بریتییە لە کۆمەڵێك بنەمای ڕێکخستنی جێبەجێکاری لایەنێکی کارگێڕی دەریدەکات بە مەبەستی ڕاڤەکردنی بناغەی دەقەکان کە یاسایەکی لەسەر داڕێژراوە بۆ جێبەجێکردنی بە سانایی، یان دەرکردنی یاسا بۆ ئەو هۆکارانەی یاسا ڕێکی نەخستووە تابلۆی کارگێڕی چەندین جۆری هەیە وەك جێبەجێکاریو ڕێکخستنو وەك یەك (مطابق)..هتد.

* تابلۆی شانازی: بریتییە لە پارچەیەك لە شێوەی ڕۆژنامە بە دیواردا هەڵدەواسرێت، بە زۆری لە کۆمپانیاو دامەزراوە بەرهەمهێنەکاندا دەبینرێت، هەروەها لە ڕێکخراوە پەروەردەییو گشتییەکاندا هەیە. ناوو وێنەی ئەوانەی تێدا هەڵدەواسرێت کە باڵادەستبوون لە ڕووی زانستیو بەرهەمهێنانەوە، پێشتر لە سستمە ئیشتراکییەکاندا ئەم تابلۆیانە لە گۆڕەپانە گشتییەکانو دامەزراوەکانو کێڵگەکاندا هەڵدەواسران، بڕی بەرهەمو داهێنانی ئەو کەسە لێهاتووانەیان لەگەڵ ناو وێنەکانیان بڵاو دەکردەوە، ئەم شێوازە لەو ڕژێمانەدا هۆکاری لاوازیی لایەنی ماددی بۆ بەرامبەر لایەنی مەعنەوی، کەسە لێهاتووەکان کە ناویان لەو تابلۆیانەدا بڵاو دەکرایەوە بە خت یاوەریان دەبوو بەوەی هەڵدەنران، چونکە دواتر گفتوگۆی ڕادیۆیو دەنگو ڕەنگیان لەگەڵدا سازدەکراو نیشانەی میللی بە بەرۆکیاندا هەڵدەواسراو جێگای ڕێزی خەڵكو حکومەت بوون.

# ڕێکخستنی پازڵی ژیان

و: درەخشان بەهادین

هیچ شتێك بە ڕەهایی باش، یان خراپ نییە، گرنگ ئەوەیە لە زانستو تێگەیشتنمان لە کاتو جێی خۆیدا کەڵك وەربگرین، هەروەك پارچەو بەشەکانی یاری پازڵ کە پارچەیەکی ڕەش بە ئەندازەیی پارچەیەکی سپی گرنگە، کاتێك لە شوێنی خۆیدا دابنرێت لە تەنیشت بەشەکانی تر تەواوکەرو جوانی بەخش دەبێت بۆ وێنەیەك.

پازڵ یارییەکی فیکرییە کە لە چەند بەشو پارچەیەکی بچووکی نارێك پێکهاتووە کە بە ڕێکخستنو دانانێکی لێزانانە وێنەیەکی ڕێکی واتادار دروست دەبێت بۆ ئاسانکاری زیاتر لە یارییەکەدا باشترین ڕەوشت ئەوەیە کە سەرەتا پارچە گرنگو سەرەکییەکانی بدۆزینەوەو لەسەر بنەمای ئەوان پارچەکانی تر ڕێك بخەین، بەڵام هەندێجار دۆزینەوەی پارچە سەرەکییەکان کەمێك دژوارە، لەوانەیە دووچاری سەر ئێشە بین، چونکە پارچەکە زۆر لامان ڕوون نییە، بەڵام بەرە بەرە ڕەوشی دانانو ڕێکخستنی پارچەکان خێراتر دەبێت، ئێستا ئەم پازڵە بە ژیانی ڕۆژانەی تاکێك دەچوێنین، ڕەفتار، ئەندێشە، گوفتارو لایەنە گرنگەکانی ژیانی تاکێك پارچەکانی پازڵی ژیانن و لەوانەیە هەر پارچەیەك بە تەنیا نارێك، جوان، ڕەنگدار، یان بێ ڕەنگ، بێت، بەڵام چ باش بێت، چ خراپ، بۆ پێکهێنانی وێنەیی ژیانو پێویستو زەرووریيە، نەبوونی هەر یەك لەو پارچانە وێنەی ژیان دەڕووشێنێت.

بۆ دەست پێکردنو دانانی بەشەکانی یاری پازڵ بەر لە هەر شتێك دەبێت بزانین کە کام پارچە لە شێوەو وێنەی ژیان بۆ ئێمە گرنگترە دواتر بە هۆی هەڵبژاردنێکی دروست، کاری ڕێکخستن ساناو خێرا تر دەبێت.

بەڵام جیاوازی یاری پازڵ لەگەڵ پازڵی ژیان لەوەدایە کە ژیان وەك پازڵێکی چەند ڕووە، ئەوە ئێمەین کە بە دەستنیشانکردنی پارچە سەرەکیو گرنگەکانی هەر ڕوویەك بمانەوێت وێنای دەکەین، پارە، ئیمان، پێویستییە مادیو نیازە مەعنەوییەکان، پلەو پایە، ڕێکیو ڕاستیو هاوڕێیەتی لەگەڵ کەسانی تر، هەر شتێك کە لامان گرنگو بە ئەرزشترە، ئەوە دەبێتە پارچە سەرەتاو سەرەکییەکانی ژیانو پارچەکانی تر بە نزیکبوونو لەسەر بنەمای ئەوان لەگەڵ یەکدا ڕێکدەخرێن.

وێنەی بەرجەستەبووی پازڵ دەکرێت یەکپارچە ڕەنگی ڕەش، سپی، زەرد، یا هەر ڕەنگو شێوەیەکی هەبێت، دەکرێت لە پێکهاتەو ڕەنگو شێوەی جیاواز پێك بێت، یا وێنەیەکی جوان بێت بە ڕەنگێکی نەشیاو، بەڵام وێنەی پازڵی ژیان کاتێك جوان دەبێت کە وێنەو ئەنجامی کۆتایی لەگەڵ خواستو وێنەی ویستراو هاوتەریب بێت.

وێنەکە هەر چەند جوان بێت، بەڵام بۆ ئەوانەی کە لە هزریاندا وێنەیەکی تریان داناوەو ویستووە دڵخۆشکەر نابێت.

پارچەو بەشەکانی پازڵی ژیان دەبێت بە درێژایی ژیان جۆرێك دەستنیشانو ڕێکبخرێت، کە ژیان گەرمو گوڕو چالاکتر بکات، ئێمە بۆ بەردەوام بوون هان بداتو لە کۆتاییدا ئەوەی لە هزرماندا هەبووە بنەخشێنێت، چەند باش دەبێت ئەگەر ئەو وێنەی کە لە کۆتاییدا پێك دێت، هەم بۆ خۆمان، هەروەها بۆ دەوروبەرمان سەرنجڕاکێشو نیشاندەری ڕاستییەکانی دەروونو بۆچوونەکانمان بێتو نیازی بە چواندنو شیکردنەوە بۆ خۆمانو دەوروبەر نەبێت، چەندیش ناخۆش دەبێت ئەگەر لە کۆتاییدا بۆمان دەرکەوێت ئەو وێنەی کە دەرچووە لەگەڵ ئەوەی کە خواستی ئێمە بووە جیاوازە، لەوەش خراپتر ئەوەیە کە هەست بکەین تەواوی پارچە ڕێکخراوەکان دەبێت هەڵبووەشێنینەوەو سەر لە نوێ ڕێکی بخەینەوە، بەڵام دەرفەتی دووبارە ڕێکخستنەوەمان نەبێت.

سەرچاوە: موفقیت

# هاورێی باڵندەکان

ن: حەمدی هاشم حەسانین
و: محەمەد مێرگەیی

ڕێبوار کوڕێکی باشی هەمیشە دەم بە خەندەیە، وانەکانی بە تەواوی دەخوێنێت. ئارەزوویەکی جوانی هەیە، ئەویش چاودێریی کردنی باڵندەکانە لەو کاتەی بە ئاسماندا دەفڕن، بۆیە توانیویەتی ناوی زۆرێك لەو باڵندانە فێرببێت، چ لە ڕێگەی خوێندنەوەی کتێبەکانی قوتابخانەوە بێت، چ لە ڕێگەی ئەو چیرۆکە ڕەنگاوڕەنگو جوانانەی باوکی هەفتانە بۆی دەهێنێت.

ڕۆژێکیان لە پڕێکدا کۆترێکی سپی جوانی لەسەر بانی خانووەکەیان دیت، بە هێمنی لە کۆترەکە نزیك بووەوە، وای دەزانی کۆترەکە هەڵدەفڕێت، بەڵام بە پێچەوانەوە، کۆترەکە هەر تەماشای ئەوی دەکرد بێئەوەی لە جێگەی خۆی بجووڵێتەوە، ڕێبوار بە نەرمی چەمایەوەو سەیرێکی کۆترەکەی کرد، تا بزانێت چی لێ بەسەرهاتووە، ئیتر تێگەیشت کە کۆترە بەستەزمانەکە باڵێکی شکاوە، بۆیە خەمی بۆ کۆترەکە خواردو بەزەیی پێداهاتەوە، نەیویست بەمشێوەیە لەسەر بانەکە بەجێی بهێڵێتو لە سەرمانو برساندا بمرێت، بە سۆزێکەوە بە ناو لەپی دەستەکانی هەڵیگرتو بردییە ژوورەکەی خۆی، ئەو ژوورەی پڕبوو لە وێنەی باڵندەکان، ئینجا کەوتە قسەو گفتوگۆ لەگەڵ کۆترەکەو گوتی: کۆتری ئازیز لە من مەترسەو نیگەران مەبە، من هەر ئێستا بۆتی دەرمان دەکەم.

ڕێبوار بە خێرایی هەندێ داری دەنکە شقارتەی هێنا، لەسەر باڵی کۆترەکەی داناو بەستییەوە، تا ئێسکی باڵەکەی یەك بگرێتەوە، دوای تەواوبوون بە بەزەییەوە کۆترەکەی بە سنگییەوە ناو.. دەیگوت: بە داخەوە ناتوانیت هەڵفڕیت تا هەفتەیەك تێنەپەڕێت، بەڵام باوەڕم پێ بکە تا تەواو چارەسەر دەبیت ئاگادارت دەبم.

لە ڕاستیشدا ڕێبوار دەستی کرد بە سەرپەرشتی کۆترەکە، هەموو ڕۆژێك دانەوێڵەو خواردنی پێدەدا، لە شەویشدا فلچەی ددانی تەڕ دەکردو بە پەڕی کۆترەکەی دا دەهێنا تاکو پاك ببێتەوە، پاشان تا درەنگی شەو لەگەڵیدا دەمایەوەو زۆرێك چیرۆکی بۆ دەگێڕایەوە، تا کۆترەکە خەوی لێ دەکەوت.

بە تەواوی دڵی بە کۆترە جوانەکە بەسترابووەوە، بەڵام دوای تێپەڕبوونی هەفتەیەكو دڵنیا بوون لە چاکبوونەوەی، دارەکانی لە باڵەکەی کردەوەو بە خۆشییەوە چاوی بڕییە کۆترەکەو گوتی:

هەرچەندە من ئێستا تۆم زۆر خۆشدەوێت، بەڵام ناتوانم زیندانیت بکەم. تۆ سەربەستییت خۆشدەوێتو شەیدای هەڵفڕینی بە ئاسماندا.. دەی ئێستا هەڵبفڕە، بەڵام نەکەی هاوڕێ وەفادارەکەت لە یاد بکەیت، ئیتر بە چاوی پڕ فرمێسکەوە کۆترەکەی ئازاد کرد.

کاتێك کۆترەکە هەڵفڕیو لە پەنجەرەکە چووە دەرەوە، وەك بیەوێت ئەوێ بەجێنەهێڵێت، گەڕایەوەو لە دەوروبەری ماڵەکە دەسووڕایەوە، پاشان تاوێك هاتە سەر شانی ڕێبوارو دەنووکە نەرمەکەی خستەسەر ڕوومەتی، وەك ئەوەی سوپاسی بکات لەسەر ئەو چاکەیەی لەگەڵیدا کردبووی، ئیتر هەڵفڕییەوە ئاسمانو ڕێبواریش هەر چاودێریی دەکرد تا بە تەواوی لێی دوورکەوتەوە.

# دوو چۆلەکەی بچکۆلە

چابك

دوو چۆلەکەی بچکۆلە لەسەر چڵی درەختێکی زەیتوونی بە تەمەن بە یەکگەیشتن، کات زستانێکی ساردو سەرما بوو..

درەختەکە زۆر گەورەبوو، بەڵام قەدەکەی لە پیریدا کلۆر ببوو، نزیکبوو بەرگەی باوبۆرانو گەردەلوولی بەهێزی ئەو زستانە نەگرێت.. چۆلەکەی یەکەم کلکی ڕاوەشاندو وتی: حەزدەکەم بۆ شوێنێکی دیکە بگوێزینەوە...

بۆ ئەم مەبەستە چۆلەکەکان بیریان لە گەڕان کردەوە بە دوای شوێنێکی گونجاوو گەرمدا، تا لە سەرمای سەختی ئەو زستانە ڕزگاریان بێت، بەڵام دوای گەڕانو هەوڵدانێکی زۆر، دوو چۆلەکە بچکۆلەکە زۆر ماندووبوون، جگە لەوەش لە دەستخستنی شوێنێکی لە بارو گونجاو یەکجار بێ هیوا بوون، ناچار گەڕانەوە بۆ لای درەختی زەیتوونەکە، چەند ڕۆژێکی کەمیان لە لانە تازەکەیاندا بەسەر برد، هێشتا بە تەواوی بە جێگەکەیان ئاشنا نەببوون، سەرمای سەختی ئەو زستانە ناچاری کردن جارێکی تر کۆچ بکەنو بە دوای شوێنێکی نوێو لانەیەکی نوێدا بگەڕێن...

لەو کاتە ناسكو ناهەموارەدا چۆلەکەی دووەم پێکەنیو بە گاڵتەجارییەوە وتی: تۆ زۆر سکاڵا دەکەیتو هەمیشە نارازیت بە بارودۆخی ژیانمانو بەردەوام پرتەو بۆڵەتە، مەگەر نازانی ئێمەی باڵندە هەموومان ژیانمان بەو شێوەیە، هەمیشە گەرمێنو کوێستان دەکەینو هەموو ماڵو جێگەکانمان کاتینو بۆ ماوەیەك، یاخود وەرزێك لێی دەمێنینەوە.

چۆلەکەی یەکەم وتی: هاوڕێ ئازیزەکەم، ئایا حەرامە ئێمە خەون بە نیشتمانێکی سەربەخۆو ماڵێکی ئارامو جێگیرو سەربەخۆیی خۆمانەوە ببینین؟ من هەمیشە خەون بەو ڕۆژەوە دەبینم کە ماڵێکی هەمیشەییمان هەبێتو ناونیشانێکی نەگۆڕمان هەبێت!!

هەر دووکیان ماوەیەك بێدەنگ بوونو بیریان لە وتەکانیان دەکردەوە! پاشان چۆلەکەی یەکەم وتی: بیر لەم درەختە بکەرەوە، لەو باوەڕەدام تەمەنی لانی کەم نزیکەی (١٠٠) ساڵ بێت، ڕەگەکانی پتەوو داکوتراون بە زەویدا، هەروەکو ئەوەی بەشێك بێت لە زەویەکە، ئەگەر بیگوێزیتەوە بۆ شوێنێکی تر لەوانەیە لە خەمو پەژارەدا گیان لە دەست بدات، چونکە ئەوەندە ئەو زەوییەی خۆش دەوێت کە چەندین ساڵە لەسەری دەژی!

چۆلەکەی دووەم وتی: بیروبۆچوونێکی سەیرت هەیە، ئایا درەختو چۆلەکە وەکو یەك وان؟ تۆ چاك دەزانیت هەر یەك لە دروستکراوەکانی خوای گەورە سروشتێکی تایبەتیان هەیە، جیاوازە لەوی تر، ئایا تۆ دەتەوێت یاساو ڕێسای ئەم ژیانو گەردوونە بگۆڕیت؟

ئێمە جیهانی باڵندەین، لەو کاتەی کە خوای گەورە دروستی کردووین، بە هۆی باڵەکانمانەوە دەفڕینو ئاسمانی دارستانەکانو دەریاو چیاکانو دۆڵو ڕووبارەکان دەبڕین!!

لە ژیانماندا کۆتو بەند نازانین چییە، بە ئارەزووی خۆمان بۆ هەر کوێ بمانەوێت دەچینو سەردانی دەکەین، مەگەر مرۆڤێکی بێبەزەیی بمانگرێتو بمانخاتە قەفەسێکەوە!!!

نیشتمانی ئێمە ئەم گەردوونو ئاسمانە گەورەیە، بە هەموو گەردووندا دەسوڕێینەوە، گەردوون بە نیسبەت ئێمەوە لە شەقەی باڵدانێکە.

چۆلەکەی یەکەم وەڵامی دایەوەو وتی: تێ دەگەم، تێ دەگەم، ئەوەندەش نەزانو بچووك نیم!

من دەمەوێت پێناسێکم هەبێت، ناونیشانێکم هەبێت، نیشتمانێکم هەبێت، وا گومان دەبەم کە تۆ لە داواکارییەکانی من تێناگەیت!

چۆلەکەی دووەم ئاوڕی دایەوە، هەورێکی ڕەشی لە ئاسمان بینی بە خێرایی نزیك دەبێتەوە، بە دەنگێکی بەرز هاواری کردو وتی: کاتی ئەم قسانە نییە، بە خێرایی بە ڕێکەوە، تا لەم شوێنە دەربچین، پێش ئەوەی باوبۆرانەکە لێمان بدات، با چیدی کاتمان بە فیڕۆ نەدەین...

چۆلەکەی یەکەم بە ساردییەکەوە وتی: هاڕێی ئازیزم، دەڵێی چی، گەر لەم شوێنە بمێنینەوەو ئەم درەختە جێ نەهێڵینو بیکەینە ماڵی هەمیشەیی خۆمان؟ وادەزانم ئەم درەختە بەهێزەو دەتوانێت لەبەردەم ئەم باوبۆرانەدا خۆی ڕابگرێت!

چۆلەکەی دووەم بە تووڕەییەوە وەڵامی دایەوە: خەون گەلی بێ مانا بەسە، ئێستا با دەربچین، ئەگەرنا جێت دەهێڵم!

هەردوو چۆلەکەکە بووە شەڕو هەرایان...

درەختەکە بە دەنگە دەنگو ئاژاوەکەیان زۆر هەستی بە بێزاری کرد، لقو چڵەکانی زۆر بە توندی ڕاوەشاند، چۆلەکەکان لە ترسا دایان لە شەقەی باڵو درەختەکەیان جێهێشت، وەکو تیر دەرچوون تا بگەنەوە بە پۆلەکەیان.

# خراپترین هەشت هەڵەی ئابوری لە مێژوودا

بەشی یەکەم

و: ئەمیر ئەحمەد عەبدولقادر

پیاوێکی دانا دەڵێت: ئەو کەسانەی پەندو ئامۆژگاری لە هەڵەکانیان وەرناگرن، بێگومان جارێکی ترو دووبارە دەکەونەوە هەمان هەڵەوەو دووچاری زیانی ماددی دەبنەوە، لە مێژوودا چەندین هەڵەی ئابوری ئەنجام دراوە کە زەرەروزیانی ماددی زۆرو بێ شوماری بە دواوەبووە. گۆڤاری (فۆربس) هەندێك نموونەی گەورەترین هەڵە ئابورییەکانی لە مێژوودا باسکردووە کە بە درێژایی چوارسەدەی ڕابردوو ڕوویان داوەو تیایاندا چیرۆك و بە سەرهاتی هەڵەکان لە چەند بوارێکدا نیشان دراوە، وەکو بواری پیشەسازیو بیناسازیو تەکنەلۆژیا، بێگومان ئەم هەڵانەش بە شێوەیەکی پلەبەندی ڕێکخراون لە خراپەوە بەرەوخراپتر لە ڕووی زیانی ماددیەوە:

**یەکەم: فۆرد مۆتۆر:**

لە ناوەڕاستی پەنجاکانو دوای ئەوەی ئۆتۆمبێلەکانی (پاندربیرد) سەرکەوتنێکی گەورەی بە دەست هێنا (فۆرد) ویستی چەشنێکی نوێ لە ئۆتۆمبیل دابهێنێ بۆئەوەی ڕکابەری ئۆتۆمبیلی (ئۆلدزمۆبیل)بکات کەکۆمپانیای (جنرال مۆتۆرز) بەرهەمی دەهێنێت. ئەوەبوو کۆمپانیای فۆرد ئۆتۆمبیلی (ئیدسیل)ی بەرهەم هێنا بۆ ئەم مەبەستە، بەڵام ئەو هەوڵە مایەپوچ بوو، چونکە چەشنی ئۆتۆمبیلە تازەکە زۆرجیاواز نەبوو لە ئۆتۆمبیلەکانی پێشوتری کۆمپانیاکە. هەروەها قەبارەی ئۆتۆمبیلەکە زۆرگەورە بوو. سەرەڕای ئەوەش نرخەکەی زۆرگران بوو، کۆمپانیای فۆرد دووچاری زیانێکی گەورەبوو گەیشتە ٢،٥ ملیار دۆلار، لە ئەنجامی ئەم هەڵەیە. لەپاشان کۆمپانیاکە بڕیاری ڕاگرتنی بەرهەمهێنانی ئۆتۆمبیلی (ئیدسیل)ی دا لە تشرینی ١٩٥٩

ئەوپەندو وانەیەی لەو هەڵەوە هەڵدەهێنجرێت. ئەوەیە ئەگەر کۆمپانیاکان بایەخ بەهێنانەدی خواستو داواکاری بەکاربەران نەدەن ئەوا بەرهەمەکانیان دووچاری شکستو پوکانەوە دەبێت هەروەکو ئادەم جالینسکی مامۆستای کارگێڕی لە زانکۆی تورپو سترین باسی دەکات.

# زانیاری ئابوری

بەشی یەکەم
ئا: جەلال جەبارک

## دووەم: دارمانی ئینرۆن

گەورە بەرپرسانی کارپێکردنی جیفری سکلیلینجو لێپرسراوە باڵاکانی دارایی ئەندرۆ فاستۆ سەرقاڵی فێڵو تەڵەکەبازی بوون، بە گزی کردن لە بەڵگەنامەکانداو دیاریکردن لە کارە بازرگانییەکان بۆیەکۆمپانیاکە دووچاری زیانێکی گەورەبووەوە کە گەیشتە ٩٣ ملیار دۆلار. پاش ئەوەی سەرمایەی کۆمپانیا لە ساڵی، ٢٠٠١ (٧٨) ملیاردۆلار بووە، قەبارەی پشکەکانی زۆرکەم بووەتەوەو بە هایان نەماوە، ئەوانەی هۆکاربوون لە دارمانی کۆمپانیاکە بە سزای ڕەوای خۆیان گەیشتنو ئێستاکە سزای زیندانی بەسەردەبەن.

## سێیەم: فرۆشتنی ئالاسکا

لە ساڵی (١٨٦٧) قەیسەر ئەلکساندەری دووەمی قەیسەری ڕووسیا بڕیاری دا ئالاسکا بە ئەمەریکییەکان بفرۆشێت، چونکەمەترسی ئەوەی هەبوو بە زەبری هێز ئەم دوورگەیە لە دەست بدات. ئەوەبوو لەو کاتەدا ئەمریکییەکان (٧،٢) ملیۆن دۆلاریان دا بەرامبەر کڕینی زەوییەك کە پڕی بوو، لە زێڕو نەوت کە ئێستا نرخەکەی دەگاتە (١٠٠) ملیار دۆلار.

## چوارەم: زیرۆکس

لە سەرەتای ساڵانی حەفتاکان کۆمپانیای زیرۆکس هەستا بەپێشخستنی تەکنەلۆژیای کۆمپیوتەری پێشکەوتوو کە ناوی لێ نا تەکنەلۆژیای(GUI) لە کۆتا ساڵانی هەشتاکان کۆمپانیای زیرۆکس سکاڵانامەیەکی قەزایی دژی کۆمپانیای (ئیبل) بەرز کردەوە کە ئەم تەکنەلۆژیایەی بەکارهێنابوو کە لە لایان کۆمپانیای زیرۆکسەوە بەرەوپێش برابوو. لە ئەنجامی ئەم هەڵەیەی کۆمپانیای (ئیبل) کۆمپانیای زیرۆکس بڕی (١٠٧) ملیار دۆلار زیانی لێکەوت.

* (بۆرصە): بریتییە لە بازاڕێکی بەردەوامو ڕێکخراو، کە نمایشو داواکاری تێدا ئەنجام دەدرێت بە شتومەك، یان بە نرخ لە بارێکی کێبڕکێی ئازاددا.

* یەکەم (بۆرصە)ی بازرگانی کە دروستکرا (بۆرصە)ی ( شیکاگۆ ) بوو، لە نیویۆرك، ساڵی (١٨٤٨) زایینی دروستکرا.

* یەکەم بانك لە جیهاندا ساڵی (١١٥٧)ی زایینی دروستکرا لە (لەندەن)ی پایتەختی بەریتانیا.

* گەورەترین شوێنی سکەی دراو لە جیهاندا بینایەکە لە ئەمەریکایە، کە سەر بە وەزارەتی گەنجینەی ئەمریکایە.

* یەکەمین بازار بۆ کاغەزی دارایی بازاڕی (ئەمستەردام)ی هۆڵەندییە کە ساڵی (١٦٠٢)ی زایینی دامەزراوە.

* گەورەترین کۆمپانیای دروستکەر لە جیهاندا کۆمپانیای (جەنەڕاڵ مۆتۆرز)ە لە ئەمەریکا.

* گەورەترین کۆمپانیای بازرگانی لە ڕووی ژمارەی کرێکارەوە لە جیهاندا (کۆمپانیای هێڵی ئاسنینی هیندی)یە کە ژمارەی کرێکارەکانی لە سەرەتای ساڵی (٢٠٠٠)ی زایینی دا بە نزیکەی (٢ ملێون) کرێکار خەملێندراوە.

* گەورەترین بانك لە جیهاندا بانکی (جیهانی)یە لە (واشنتۆن)ی پایتەختی ئەمەریکا.

* گەورەترین بانکی بازرگانی لە جیهاندا بانکی (دای- ئیشی کانغێو)یە لە وڵاتی یابان.

* کۆنترین بانکی سەربەخۆ لە وڵاتە یەکگرتووەکان بانکی (ك.هور- k.hoor )و هاوبەشەکانییەتی کە ساڵی (١٦٧٢)ی زایینی دامەزراوە.

* کۆنترین پارچەدراو لە جیهاندا تێکەڵەیەکی سروشتییە لە ئاڵتونو زیو کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی مەلیك (لیدیا)ی تورکی ساڵی (٦٣٠) پێش زایین.

* کۆنترین پارچەدراوی هەڵکۆڵین لە مێژوودا درهەمێکی چوار گۆشەیی دارشتەی (زەڕنیخ)ە لە دوورگەی (صقلیە) کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (٤٩٤) پێش زایین.

* سووکترین کێشی دراو لە جیهاندا پارچە دراوێکی زیوییە لە نیپاڵ کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٧٤٠) زایینیو کێشەکەی تەنها (٠،٠٠٢) گرامە.

* (تیمشیلك) دراوێکی میسری بوو لە زیو کە لە سەردەمی عوسمانییەکان ئاڵوگۆڕی پێدەکراو نرخەکەی شەست بار بوو.

* یەکەم بانکی ئیسلامی لە ساڵی (١٩٨٣)ی زاینی لە وڵاتی قەتەر بە سەرمایەی (٣٠٠) ملێون ڕیاڵ کرایەوە.

* (٦٩) پارچە درهەمی یەعقوبی، کێشی یەك ئۆقەی مەغریبییە.

سەرچاوە/ ئینتەرنێت ماڵپەڕی (www.rbsc.com٣)، بانکی زانیاری لە (٨٥٠٠) پرسیارو وەڵام دا.

# ناسینەوەی بەڕێوەبردنی پەیوەندی لەگەڵ کڕیارەکاندا

ئاستە جیاوازەکانی بەڕێوەبردنی پەیوەندی لەگەڵ کڕیارەکاندا

بە شێوەیەکی گشتی، سێ ئاست بۆ بەڕێوەبردنی پەیوەندی لەگەڵ کڕیارەکان دەستنیشان کراوە: بەڕێوەبردنی پەیوەندی کرداری لەگەڵ کڕیاردا، بەڕێوەبردنی پەیوەندی شیکراوە لەگەڵ کڕیاردا، بەڕێوەبردنی پەیوەندی بەشداربوو لەگەڵ کڕیاردا.

١- بەڕێوەبردنی پەیوەندی کرداری لەگەڵ کڕیاردا:

بەڕێوەبردنی کرداری لەگەڵ کڕیاردا، ئاماژە بەو خاڵانە لە بەڕێوەبردنی پەیوەندی لەگەڵ کڕیار دەکات، کە بەرامبەر کڕیارەکان دەبێتو دەبێتە هۆی یەکگرتنەوەی بەشەکانی.ئەم پەیوەندییە هەوڵ دەدات باشترین شێواز بۆ تاکەکانو سروشتی کارکردنیان دابین بکات. لەو ئاستە لە بەڕێوەبردن هەنگاوەکانی بازرگانی لەو بەشانە کە بەرپرسن لە پەیوەندیکردن لەگەڵ کڕیارەکان، وەك بەشەکانی فرۆشتن، بازاڕسازیو خزمەتگوزاری پشتگیریان لێ دەکرێتو ئەرکەکانی ئەم هەنگاوانە بە فەرمانبەرانی هەمان بەش دەسپێردرێتو زانیارییەکانی پێویست بۆ جێبەجێکردنی ئەرکەکانیان ڕوون دەکرێتەوەو ئەو کارو چالاکییانە کە بەرامبەر کڕیارەکان ئەنجام دەدرێت بۆ سوود وەرگرتن لە داهاتوو تۆمار دەکرێت.

٢- بەڕێوەبردنی پەیوەندی شیکراوە لەگەڵ کڕیاردا:

بەڕێوەبردنی پەیوەندی شیکراوە لەگەڵ کڕیارەکان گرنگی بە داتاو بەڕێوەبردنی زانست لە ناو ڕێکخراو دەداتو هەنگاوەکانی داتاکانی پەیوەندیدار بە کڕیارو بەرهەمهێنراو بە هۆی پێکهێنەرە کردارییەکان شیدەکاتەوە، ئەویش بە مەبەستی بەڕێوەبردنی کردارە بازرگانییەکان.

لەو ئاستە، داتاکانی کۆکراوە لە ئاستی بەڕێوەبردنی کرداری لەگەڵ کڕیار، بە مەبەستی پۆلین کردنی کڕیارەکانو ناسینەوەی توانای فرۆشتنی زیاترو دەرەکیو پێوانە شی دەکرێتەوە. کردارە کۆکراوەکانی، پێوانەو شیکردنەوەی بە شێوەیەکی بەردەوامو لەدوای یەك ئەنجام دەدرێت. ئاڵوگۆڕکردنی داتاکانی لە بانکی زانیاری ڕێکخراو بۆ زانیارییەکی بەسوود بە مەبەستی وەرگرتنی بڕیار لە ڕێگای لێکدانەوەی داتا، یان دەرهێنانی داتاکان ئەنجام دەدرێت. سوود وەرگرتن لە زانستی توێژینەوەی داتاکانو سیستەمەکانی زانیاری بە مەبەستی دۆزینەوەی زانیاری پێویست لە نێوان گروپێکی زۆر لە زانیاری تاکە ڕێگایە بۆ خستنەڕووی زانیاری شیاو بە کڕیارەکانو دروستکردنی پەیوەندییەکی پتەو لەگەڵیاندا.

لە باشییەکانی بەڕێوەبردنی پەیوەندییە دەکرێت ئاماژە بکەین بە پێوانەو شیکردنەوەی قازانج، چاودێری ڕووداوەکانو توانای پۆلین کردنی کڕیارەکان.

١- بەڕێوەبردنی پەیوەندی بەشداربوو لەگەڵ کڕیاردا:

بەڕێوەبردنی پەیوەندی بەشداربوو لەگەڵ کڕیارەکاندا خزمەتگوزاری بەشداربووان لە خۆ دەگرێت، کە دەبێتە هۆی ئاسانکاری هەڵسوکەوتکردنی کڕیارو ڕێکخراو. بە دروستکردنی پەیوەندییەك بە بنچینەی بەشداربووانو بەهایەك لە ماوەی ژیانی کڕیارو زیاتر ئاڵوگۆڕی شتومەكو خزمەتگوزاری دروست دەبێت. بەڕێوەبردنی پەیوەندی بەشداربوو لەگەڵ کڕیار بە واتای بەشداری لە نێوان تەواوی کەناڵە پەیوەندیدارەکان لەگەڵ کڕیار، وەك (مۆبایلو ئینتەرنێت). ئەم شێوازە چارەسەرێکە کە تاك، کردارو داتاکان لە تەنیشت یەك دادەنێت بە شێوەیەك کە ڕێکخراو توانای خزمەت گەیاندنو پارێزگاریکردنی باشتری دەبێت بە کڕیارەکان، لە ڕاستیدا، سوود وەرگرتن لە بەشداربووانو یارمەتی وەرگرتن لە ئینتەرنێت تێچوونەکانی خزمەتگوزاری بە کڕیارەکان کەم دەکاتەوە.

یەکێکی تر لە پۆلین کراوەکانی ئاستە جیاوازەکانی پەیوەندی لەگەڵ کڕیارەکان لە خشتەی خوارەوە نیشان دراوە:

پۆلین کردنی ئاستە جیاوازەکانی بەڕێوەبردنی پەیوەندی لەگەڵ کڕیارەکان:

| ئاستەکانی بەڕێوەبردنی پەیوەندی لەگەڵ کڕیارەکاندا | لێکۆڵینەوە و تۆێژینەوەکانی هەر ئاستێك |
|---|---|
| بەڕێوەبردنی ستراتیژی لەگەڵ کڕیارەکاندا | گەشەپێدانی ستراتیژی پەیوەندی لەگەڵ کڕیار، واتە دیاریکردنی کڕیارە ڕاستەقینەکانو کردارەکانی ناوەوەی ڕێکخراو کە بەرەو ڕوویان دەبێت، دیاریکردنی ئەو بەربەستانە کە ڕووبەڕوویان دەبێتەوە لەگەڵ بەڕێوەبردنی جۆراوجۆریو نوێبوونەوەی بەرهەمەکان. |
| بەڕێوەبردنی کرداری پەیوەندیدار لەگەڵ کڕیارەکاندا | خزمەت گەیاندن بە کڕیارەکان، کردارەکانی بازاڕسازی، دووبارە ئەندازیاری کردنی کارەکان، بەڕێوەبردنی داواکارییەکان |
| بەڕێوەبردنی چۆنییەتی پەیوەندیکردن لەگەڵ کڕیارەکاندا | توانای بانکی زانیاری، یەکگرتنەوەی بانکی زانیاریو تایبەتمەندییەکانی ناوەندی پەیوەندییەکان. |
| بەڕێوەبردنی پەیوەندی بەشداربوو لەگەڵ کڕیارەکاندا | پۆلین کردنو شیکردنەوەی زانیاری گروپەکانی داتاکان، شیکردنەوەی نرخی بەهای سەرمایەکانو ...هتد. |

ڕوون کردنەوەی سیستەمی بەڕێوەبردنی پەیوەندی لەگەڵ کڕیارەکان:

بۆ دامەزراندنی ئەو سیستەمە دەبێ سوود لە پێکهێنەری پرۆگرامی تایبەت وەربگیرێت، ئەو سیستەمانە ناوکی سەرەکیو باوەڕپێکراون کە هەموو ڕێکخراوەکان بە پێی بارۆدوخیان لە ڕێگای تەواوکردنو گەشەکردنی داواکارییەکان سوود لەو سیستەمانە وەردەگرن. سیستەمەکانی بەڕێوەبردنی پەیوەندی لەگەڵ کڕیارەکان ئێستا لە پێنج بەشی سەرەکی پێکهاتووە، بەڵام بە ئەگەرێکی زۆر لە داهاتوو گۆڕانی بەسەردا دێتو زیاد دەکرێت:

١- جەخت کردن لە زانیاری کڕیارەکان لە یەك خاڵدا:

لە بارۆدوخی ئێستا، لە زۆربەی ئەو ڕێکخراوانە کە زانیاری کڕیارەکان بە شێوەی ورد لە شوێنە جیاوازەکان دەپارێزن ئەو زانیارییانە لە شوێنە جیاوازەکان وەك وردبینی، کاروباری دارایی، خزمەتگوزاری پاش فرۆشتنو...هتد، کۆ دەکرێتەوە. ئەوا لە کاتێکدایە کە بە هۆی پەرتو بڵاوبوونەوەی زانیاری کڕیارەکان، بە مەبەستی سوود وەرگرتن لە زانیاریو گەشەسەندنی بازاڕسازی کێشەیەکی زۆر دروست دەبێت.

٢- شی کردنەوەو پێوانەو لێك جیاکردنەوەی زانیاری کڕیارەکان:

لە جۆراوجۆری شتومەكو خزمەتگوزارییەکانی ڕێکخراو، ئەو بەشە هەڵدەستێت بە جیاکردنەوەی کڕیارەکانو پێوانەو شیکردنەوەی تایبەت بۆ بارۆدوخی ئێستاو گەشەسەندنی بازاڕەکانی بە پێی زانیارییەکانی هەر بەشێك.

٣- تایبەت کردنی پێداویستی کڕیارەکان بە هۆی توانای پەیوەندی تایبەت لەگەڵیاندا:

ئەو بەشە دەتوانێت پێداویستی کڕیارەکان بە شێوەیەکی تایبەت کۆ بکاتەوەو لە بەردەم ڕێکخراو دابنێت تاوەکو ڕێکخراو بتوانێت پێداویستی تایبەتی ئەوان دابین بکات.

٤- ئەگەری پەیوەندیکردن لەگەڵ کڕیارەکان لە ڕێگای ئەو هۆکارانە کە کڕیار دەیەوێت:

هەندێ لە کڕیارەکان لە کاتی پەیوەندیکردن بە سیستەمی فاکس هەندێکی تر پۆستی ئەلیکترۆنی، یان نامەو... هتد، بەکاردەهێنن، ئەو بەشە پەیوەندییەکی خێراو چالاك لەگەڵ کڕیارەکان دروست دەکات بە هۆکارە دەستنیشان کراوەکانی هەر کڕیارێك.

٥- گواستنەوەی زانیاریو ئاڵوگۆڕکردنی لە نێوان کڕیارو ڕێکخراو:

تەواوی پەیوەندیو ئاڵوگۆڕکردنی زانیاریو کارەکانی نێوان کڕیارو ڕێکخراو لە ڕێگای ئەو بەشە دەبێت، ئەو زانیارییانە داواکاری شتومەكو خزمەتگوزارییەکان، زانیاری دارایيو پێدراوەکان، زانیاری دروستکردنو تەواوکەری داواکاری کڕیارەکان، ناردنەوەی شتومەكو خزمەتگوزاری بۆ کڕیارەکان، ناردنی لیست، زانیاری ناردنی شتومەكو خزمەتگوزارییەکانی پاش فرۆشتنی شتومەکەکان، فێرکردنو پشتگیری کردنی کڕیارەکانو... هتد.

لە کۆتاییدا: گومان لەوەدا نییە کە ئەمڕۆ بە دەستهێنانی ڕەزامەندی کڕیار شوێنێکی گرنگو هەستیاری هەیە، بۆ دەستەبەرکردنی ئامانجو مەبەستەکانی ڕێکخراو، بەڕێوەبەرە سەرەکییەکان بە باشی دەزانن کە سەرکەوتنیان بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان، لە پێناو بە دەستهێنانی ڕەزامەندی کڕیارەکانە.

بەڕێوەبردنی پەیوەندی لەگەڵ کڕیارەکان، ڕێگە چارەی بەڕێوەبردنی بەرامبەرانەیە لەگەڵ کڕیارەکان بە مەبەستی پتەوکردنی بەهاو بە دەستهێنانی وەفاداریو ڕەزامەندی درێژەخایەنی کڕیارەکان. بە هەستکردن بە پێداویستی کڕیارەکان، کەمکردنەوەی تێچوون، ڕاکێشانی کڕیاری نوێو پارێزگاریکردن لە کڕیاری کۆن بە سوود وەرگرتن لە تەکنەلۆژیای نوێ لەگەڵ گۆڕانی گۆشە نیگای ڕێکخراوەکان بەرامبەر بە کڕیار بۆ چارەسەرکردنی ڕەزامەندییان، هەوڵ دەدات تا تەواوی قۆناغە جۆراوجورەکانی فرۆشتن بەڕێوەبباتو سات بە سات لە یەکەمین پەیوەندی تا دابینکردنی ڕەزامەندی کڕیارەکان، پەیوەندییەکی شیاو لەگەڵیان دروست بکات.

هەروەك یارمەتی کۆمپانیا بازرگانییەکان دەدات تاوەکو بە ناسینەوەو جەختکردن لەسەر ئەو کڕیارانە کە بە های ئابووری زیاتریان هەیە، قازانجی ڕێکخراو زیاتر بکەن. هەرچی باشییەکانی بەڕێوەبردنی پەیوەندی لەگەڵ کڕیارەکانە لە هەر ڕێکخراوێك بە مەبەستی بە دەستهێنانی ڕەزامەندی کڕیارەکانو مانەوەی ڕێکخراو لە سروشتی ڕکابەرایەتی دەکرێت لەم خاڵانەی خوارەوە کورت بکرێتەوە:

١- کەمکردنەوەی تێچوونەکانی بازاڕسازیو فرۆشتن.

٢- توانای ناسینەوەی شێوەکانی خەرجی لە لایەن کڕیارەکان.

٣- ڕاکێشانی خێراو کاریگەرانەی کڕیارەکانو هەستکردن بە پێداویستییەکانیان.

٤- زیادبوونی ڕێژەی وەفاداری کڕیارەکان بە ڕێکخراو.

٥- پێکهێنانو فەراهەمکردنی بارۆدوخی گەڕانەوەی کڕیارەکان.

بەرزان ئەبوبەکر

# ئاکامی بڕوا بەخۆنەبوون

هەندێك لە خەڵکی وادەزانن نەریتو ئاکار بریتییە لەوەی کە لەسەری دروست بوویت، ئەم بنەمایە لە هزریاندا وێنا دەکەنو وادەزانن بنەمایەکی نەگۆڕەو ناکرێت بگۆڕدرێت... لەبەرئەوە تەسلیمی واقیع دەبنو قەناعەتی پێ دەکەن، هەروەکو چۆن تەسلیمی درێژی بالایان، یان ڕەنگی ڕووخساریان دەبنو بڕوایان وایە ناکرێت بالا بگۆڕێت...

لەگەڵ ئەوەشدا کەسانی زیرەكو لێهاتوو پێیان وایە گۆڕینی سروشتو هەڵسوکەوتی مرۆڤ لە گۆڕینی جلوبەرگ ئاسانترە، سروشتمان وەکو شیری ڕژاو نییە کە ناتوانرێت کۆبکرێتەوە، بەڵکو سروشتو هەڵسوکەوت بە دەست خۆمانەوەیە، بەڵام کەسانێك هەن کە متمانەیان بە خۆیان نییە، بە زوویی دەکەونە ژێر کاریگەری دەوروبەریانەوە، هەر کاتێك کارێك ئەنجام دەدەن، یان دەیانەوێت بڕیارێك لەسەر چارەنووسی خۆیان بدەن، ئەگەرچی ماوەیەکی زۆر بیر لەو بابەتە دەکەنەوە، بەڵام کاتێك ڕەخنەیان لێ دەگیرێت، دەکەونە گومانەوەو وا دەزانن ئەوان لە هەڵەدان...

ئیبن حەزم لە کتێبی کۆتی کۆتردا «طوق الحمامة» دەڵێت: لە وڵاتی ئەندەلوس بازرگانێکی بە ناوبانگ هەبوو، چوار بازرگانی هاوڕێی کێبڕکێیان لەگەڵدا دەکرد، زۆریش ڕقیان لێی بوو... بەردەوام هەوڵیان دەدا بێزاری بکەن..

ڕۆژێکیان ئەم بازرگانە بە ناوبانگە کراسێکی نوێی سپیو عەمامەیەکی جوانی پۆشیو زۆر بە دڵ خۆشییەوە بەرەو نووسینگەی کارەکەی ڕۆیشت، لە ڕێگادا یەکێك لەو چوار بازرگانەی پێگەیشت، سڵاوی لێکردو سەیرێکی عەمامەکەی کردو پێی وت: بە ڕاستی ئەو عەمامە زەردە زۆر جوانە، پیرۆزت بێت!

بازرگانەکەش پێی وت: چاوت نابینێت؟ ئەو عەمامەیە سپییە نەك زەرد...

ئەویش وتی: نەخێر زەردە، بەڵام زۆر جوانە...

بازرگانەکە چیدی چەلەحانێی لەگەڵ نەکردو ڕۆیشت بەرەو نووسینگەکەی، چەند هەنگاوێك دوورکەوتەوە، گەیشت بە یەکێکی دیکە لەو چوار بازرگانە، ئەویش سڵاوی لێکردو سەیرێکی عەمامەکەی کردو بە سەرسوڕمانەوە پێی وت: بەڕاستی ئەمڕۆ زۆر جوانیت، جلوبەرگەکانت زۆر نایابە، بە تایبەت ئەو عەمامە سەوزەت، یەکجار جوانە، پیرۆزت بێت...

بازرگانی بەناوبانگ وتی: پیاو، عەمامەکەم سپییە نەك سەوز!

وتی: نەخێر، سەوزە!

بازرگانەکەش بە تووڕەییەوە وتی: من دەڵێم سپییە، دوورکەوەرەوە لێم، بە خەمەوە ملی ڕێگەی گرت، بە تەواوی لە عەمامەکەی کەوتە گومانەوە بە تیلەی چاو سەیرێکی عەمامەکەی دەکرد تا دڵنیابێت لە ڕەنگی عەمامەکەی!

بە هەر حاڵ گەیشتە نووسینگەکەی، قوفڵی نووسینگەکەی کردەوەو چووە نێو نووسینگەکەی، بازرگانی سێیەم هاتو بە هەمان شێوەی هاوڕێکانی سڵاوی لێکردو بە سەرسوڕمانەوە پێی وت: ئەم بەیانییە چەند جوانی، بە تایبەت جلەکانت هەر زۆر جوانە، ئەوەش کە زیاتر جوانی کردوویت ئەو عەمامە شینەیە، بازرگانەکەش سەیرێکی عەمامەکەی کرد تا دووبارە لە ڕەنگەکەی دڵنیا بێت، پاشان بە چاوێکی ڕقاوییەوە سەیری کردو پێی وت: براکەم عەمامەکەم سپییە نەك شین!

بازرگانی سێیەم وتی: نەخێر ڕەنگی عەمامەکەت شینە، بەڵام نیگەران مەبە بە شێوەیەکی گشتی زۆر جوانە.

پاشان ماڵئاوایی لێکردو نووسینگەکەی بە جێهێشت، بازرگانە بە ناوبانگەکەش هاواری کرد، عەمامەکەم سپییە، عەمامەکەی لە سەری داگرتو سەیری کردو ئەمدیواو دیوی کرد، هەر چەندە لە عەمامەکەی ورد دەبوویەوە، زیاتر دڵنیا دەبوو کە ڕەنگی عەمامەکەی سپییە!

ئەو بەیانییە بە تەواوی مەزاجیان تێکدا، چوویە سەر کورسی نووسینگەکەی‌و دانیشت، بەردەوام سەیری لایەکی عەمامەکەی دەکردو لەبەر خۆیەوە دەیوت: ئەم عەمامەیە سپییە ئیدی بۆچی ئەم بازرگانانە هەر یەکە بە ڕەنگێك دەیبینێت؟ لەو کاتانەدا بازرگانی چوارەم هات بۆ لای، ئەویش بە هەمان شێوە زۆر بە گەرمی سڵاوی لێکردو وتی: ئەو عەمامە سورەت لە کوێ کڕیوە؟ بازرگانەکە هاواری کرد بە سەریداو وتی: عەمامەکەم سپییە، بازرگانی چوارەم زۆر بەهێمنییەوە وتی: نەخێر سورە...

پاشان بازرگانی بە ناوبانگ وتی: سەوزە، نەخێر، نەخێر، سپییە، نەخێر شینە، ڕەشە، ئیدی دەستی کرد بە پێکەنین، پاشان هاواری کرد، دوای ئەوە دەستی کرد بە گریان، لە ئەنجامدا هەستاو نووسینگەکەی جێهێشتو ڕایکرد...

ئیبن حەزم دەڵێت: سەرەنجام ئەو بازرگانە دەوڵەمەندەم بینی بە نێو شەقامەکانی ئەندەلوسدا بە شێتی دەسوڕایەوەو منداڵان گاڵتەیان پێ دەکرد!!

سەرنج بدە چوار بازرگان بە پێی پیلانێکی سادە توانیان سروشتی ئەو کابرایە بگۆڕن، نەك هەر سروشتی، بەڵکو عەقڵیشیان گۆڕی.

ئەگەر مرۆڤ بڕواو متمانەی بە خۆی هەبێت، هیچ کات دووچاری ئەم جۆرە ڕووداو کارەساتانە نابێت، ئەگەر کاکی بازرگان، من، تۆ، هەموومان، بڕوامان بە خۆمان هەبێت، جلوبەرگێك، یان ڕەنگێك بە لای ئێمەوە جوان بێت، با لای هەموو خەڵکی ناشیرین بێت، بۆ دەبێت قسەو گوتەی خەڵکی دوودڵو ڕاڕامان بکات لەو جلوبەرگەی کە لەوانەیە چەندین دوکان گەڕابین تا ڕەنگێکمان بە دڵی خۆمان هەڵبژاردووە، لەوانەیە جلوبەرگیش شتێکی ئاسایی بێت، بەڵام کارەکە تەنها لە جلوبەرگدا کورت هەڵناهێنێت، زۆرجار ئەم ڕووداوە کاریگەری نێگەتیفی لەسەر شتە چارەنووسسازەکانی ژیان دەبێت، زۆر جار دەبینین کوڕێك، یاخود کچێك، چەندین ساڵ عەوداڵی هەڵبژاردنی هاوسەرێکە کە لە هزری خۆیدا وێنای کردووە، دواجار کەسێك بە دڵی خۆی، بە چاوی خۆی، هەڵدەبژێرێتو بڕیاری پێکەوە ژیانو بەستنی گرێبەستی هاوسەرێتی لەگەڵدا دەدات، بەڵام کاتێك خوشکێکی، یان یەك لە دۆستانی چاوی بە کچەکە دەکەوێت، لە بری پیرۆزباییو هیواخواستنی بەختەوەری بۆ هەردووکیان، هەزارو یەك ڕەخنە لە کچی داماو دەگرێت، کوڕی بێچارەش ئەگەر پەشیمانیش نەبێتەوە دەکەوێتە گومانێکی زۆرەوە لەسەر ئەو کەسەی کە چەندین ساڵە خەون بەو ڕۆژەوە دەبینێت، کە ئەو ئافرەتە ببێتە هاوسەری، جاری واش هەیە کار دەگاتە هەڵوەشانەوەی کارەکەیان، هەموو ئەمانەش لە ئەنجامی قسەو قسەلۆکی پیاو باشانەوە بوو!

لە کۆتاییدا دەڵێین: جوانی لای هەر کەسێك پێناسەیەکی هەیە، ئەو ڕەنگەی، یان ئەو ڕووخسارەی لای تۆ جوانە، ڕەنگە لای بەرامبەر بەو شێوەیە جوان نەبێت، لەبەرئەوە ناگونجێت هەموو دنیا یەك ڕەنگیان بە لاوە جوانو پەسەند بێت، هەروەك چۆن ناکرێت هەموو دنیا وەك یەك بیر بکەنەوە، جوانیش هەر وایە!

کەواتە با هەر یەکەمان بڕوامان بە خۆمان هەبێتو قسەو قسەلۆکی کەسانی ڕەشبینو بیر تەسك کارمان تێ نەکەن، تا نەبینە قوربانی بیروبۆچوونەکانیان!

# بووەستە خاڵی پشکنینە!

میلاد محەممەد

لە پێش هەر بازگەیەکدا تابلۆیەك بەم نووسراوە بەرچاو دەکەوێت، هەندێك دەسە پاچە دەبن، هەندێکی تریش زۆر بێباکو ئاساییە بە لایانەوە، ئەوەی جێگەی پرسیارە ئەوەیە کە ئایا لە ژیانی تایبەتی خۆتدا هیچ بازگەیەك هەیە؟

تا ئێستا هاتووەتە پێش کە هەڵوێستەیەك بە خۆت بدەیتو بڵێی تکایە بووەستە؟ یاخود تا ئێستا ڕوویداوە لە شوێنی خۆت ڕاوەستابیو پرسیارت لە خۆت کردبێت، تا بزانیت لە کوێی ئەم ژیانە دایت؟

ئێمە دەبێت هەوڵ بدەین لە ژیانی خۆماندا، زیاتر لەم خاڵو بازگانەمان هەبێت، دەبێت هەندێك کات باشتر بیر لەو کارانە بکەینەوە کە ئەنجامی دەدەین، چونکە هەر پێشهاتێك کە ڕوو دەدات ئەنجامی کاری ڕەفتاری خۆمانە، گرنگ نییە کە چ کەسێکی، تەنها لەسەر ڕێی ژیانتدا تابلۆی وەستانو چاوخشاندن بە ژیانت هەبێت تا لە ئایندەدا ئەنجامی کارەکانت نەبێتە زالگەو وەستانێکی تەواوت نەداتێ.

کەمێك لە خودی خۆت وردبەرەوە، چاوبخشێنەوە بە کارە هەڵەکانی خۆتو ئەنجامەکانیاندا، هەوڵ بدە کە چیدی دووبارەیان نەکەیتەوە، پاشان تابلۆی بازگەکە هەڵگرەو دووبارە بکەوە ڕێ، بەڵام ئەمجارە بە سەرنجێکی زۆر تر، تا ئەگەر جارێکی تر تابلۆی خاڵی پشکنینت لە پێش خۆتەوە بینی، نەشڵەژێیت، یا خۆت لە بێ خەیاڵی نەدەیت، بەڵکو تەنها بە شانازیو خەیاڵێکی ئاسوودەوە، لە بەردەمی دا بووەستی!

سەرچاوە/ موفقیت.

# گەشەپێدانی مرۆیی دەوڵەمەند لە چەمك و هەژار لە واقیعدا

و: كاروان ڕەشید محێدین

سەرەتای سەرهەڵدانی زاراوەی گەشەپێدانی مرۆیی دەگەڕێتەوە بۆ كۆتاییەكانی جەنگی دووەمی ڕۆژئاوا، تەنانەت هەتا كۆتایی ساڵانی هەشتاكانیش.. زۆر گرنگی بە گەشەپێدانی توانا مرۆییەكان نەدەدرا.. تاكیش زۆر بە ئەستەم تونای هەبوو كە پێداویستییەكانی خۆی بە دەست بهێنێت.. بەڵام لە ساڵی (١٩٩٠)ەوە پاش ئەوەی نەتەوە یەكگرتووەكان بەرنامەی تۆكمەیان دانا بۆ گەشەپێدانی مرۆیی، ئیدی لێرەوە مرۆڤ هەستی بە گرنگی گەشەپێدان كرد.. لە كاتێكدا خۆی بە داهێنەری گەشەپێدانی مرۆیی دەبینی..؟! ئیتر لێرەوە مرۆڤ بە شوێن وەڵامی پرسیارەكاندا دەگەڕا، ئامانجەكانی گەشەپێدانی مرۆیی كامانەن..؟! چۆن دەتوانین پەرە بە توانا مرۆییەكان بدەین؟ ئەو هەڕەشەو مەترسییانە كامانەن كە لە پێناو بەدیهێنانی گەشەپێدانی مرۆییدا ڕووبەڕووی دەوڵەتان دەبنەوە..؟ لایەنە گرنگو بەهێزەكانی گەشەپێدان كامانەن؟

بێگومان مرۆڤ خۆی لە خۆیدا گرنگترین سامانی گەلانە، لەبەرئەوە ئەگەر بتەوێت ئاستی تواناو لێهاتوویی هەر گەلێك بزانیت، پێویستە لە وزەو تواناو شارەزایی دانیشتووانەكەی ورد ببیتەوە، تا ئاستی تواناو لێهاتوویی ئەو گەلە بزانیت.

بەڵێ بە شارەزا بوون لە توانای تاكەكانی كۆمەڵگە، ئیتر هەڵسوكەوتكردنی ئەو كۆمەڵگەیەت.. لەگەڵ ڕووداو و پێشهاتە نوێیەكاندا بۆ دەردەكەوێت.

بەرەو پێشچوونی چەمكی گەشەپێدانی مرۆیی:

پێویستە ئاگاداری ئەوە بین.. مرۆڤ گرنگترین سامانی گەلە، لە ڕێی وزەو توانای دانیشتووانی وڵاتەوە دەتوانێت ئاستی گەشەپێدانی مرۆییان هەڵبسەنگێنیت.

هەروەك گەشەپێدانی مرۆیی لەگەڵ بەهێز كردنو بەدیهێنانی توانا مرۆییەكاندا كۆتایی نایەت.. نموونەی گرنگیدان بەم بوارانەو ئەوانی دیكەش، هۆكارێكی بەهێزن بۆ بەهێزكردنی توانا مرۆییەكان.. وەك یەكیشە ئەگەر لەو ڕووەوە بێت كە هەوڵی داهێنان بدەیت، یان لەڕووی پڕكردنەوەی كاتەكانت بە بەرنامەو كاری سوودبەخش.. یان چێژوەرگرتن لە ڕێزگرتنی خۆتو كردنی مافەكانی مرۆڤ، یاخود بەشداری كردنێكی ڕاستەقینە لە چالاكییە سیاسیو ئابووریو ڕۆشنبیریو كۆمەڵایەتییەكاندا، بە تێڕوانینت بۆ هەموو ئەمانە بۆت ڕوون دەبێتەوە كە گەشەپێدانی مرۆیی بەرنامەیەكی گشتگیری مرۆڤە بۆ پەرەپێدان بە شێوەیەكی گشتیو بەرفراوان، نەك تەنها لە گەشەپێدانی سامانی مرۆییدا، كورت بكرێتەوە وەك هەندێك وا پێناسەی دەكەن.

هەمان كات چەمكی گەشەپێدانی مرۆیی، ناسراوترینی ئەو چەمكانەیە كە لەسەرو بەندی جەنگی دووەمی جیهانی ڕۆژئاوادا بەشێوەیەكی گشتی زۆر بەكارهێنراوەو تا ڕادەیەكی زۆر ناسراو بووە، كە ئەو كات گەشەپێدان لە خزمەتگوزارییە مادییەكانو توانای تاك بۆ وەدەستخستنی پێداویستییەكانی خۆی دا كورت كرابووەوە، واتە تاك لەگەڵ ڕادەی زیاتر وەدەستخستنی پێداویستییەكانیدا ئاستی ژیانو خۆشگوزەرانی بەرەو پێش دەچوو، لەگەڵ دەستەبەربوونی خۆشگوزەرانی تاكدا، ئیتر چەمكی گەشەپێدان بەرجەستە دەبوو.

بەڵام لە ئێستادا پێویستە ئەوە

بزانین کە لەگەڵ فراوانبوونی چەمکی گەشەپێداندا ئامانجو مەبەستەکانی تر گشتگیر تر دەبن، بە هەمان شێوەیە بۆ ئامانجە ئابوورییەکان کە گەشەپێدان بەستراوە بە شێوازی ژیانی مرۆڤەوە، نەك پەیوەست بێت بە ژیانی مرۆڤەوە، بە تەنها ئەمەش لە لایەن ڕاپۆرتەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانی تایبەت بە گەشەپێدانی مرۆیی پشت ڕاست کراوەتەوە، هەروەك تاوتوێی چەند کێشەیەکیان کرد کە پەیوەستن بە ژیانی مرۆڤەوە، وەك هەژاری لێرەدا مەبەستمان هەژاری ناوەوە نییە، بەڵکو مەبەست ئەو هەژارییەیە کە ڕێگری لە مرۆڤ دەکات تا ئەو پێداویستییانە دابین بکات، تاوەکو بە خۆشگوزەرانی ژیان بباتە سەر، یان بەسەر بردنی تەمەنو ژیانێکی درێژو سوود وەرگرتن لە لەشساغی خۆتو داهێنان کاری لە ژیاندا بە سوود وەرگرتن لە ئاستی سەربەستیو ئازادی لە کۆمەڵگاداو هەروەها ڕێزدانان بۆ کەسانی ناو کۆمەڵگاکەت، بە یەکسان سەیرکردنی دوو ڕەگەزەکە، ئاسایشی مرۆیی تەنها لەو چەمکە تەقلیدییە نییە کە ئێمە تێی گەیشتووین کە ئەویش بریتیە لە پارێزگاریکردن لە بەرژەوەندییە نەتەوەییەکان لە بەرامبەر دوژمنە دەرەکییەکاندا کە خۆیان لە چەند شێوەیەکدا نیشان دەدەن، یان پارێزگاریکردنو پاراستنی گەل لە نەخۆشیو برسییەتیو بێکاری تاکەکانی کۆمەڵگە، بەڵکو ئەو چەمکە لەو واتایە زیاتر هەڵدەگرێتو بەشێوەیەکی گشتگیر چەندین بواری نوێی تری تایبەت بە ئاسایش لە خۆ دەگرێت، وەك ئاسایشی ڕامیاری، سیاسی، ئابووری، ژینگەیی، ئاسایشی تەندروستیو ئاسایشی خۆراكو هتد.

**ئەو مەترسییانەی لە داهاتوودا ڕووبەڕووی گەشەپێدانی مرۆیی دەبنەوە:**

بە پۆلێن کردنی دانیشتووانی سەر ڕووی زەمین، بە پشت بەستن بە پێوەرەکانی گەشەپێدانی مرۆیی کە لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە ئەنجامدراوە، لێرەدا چوار حاڵەت دەبینرێت:

یەکەم: جیهانێکی پێشکەوتوو، لەڕووی مرۆییو ئابوورییەوە.

دووەم: جیهانێکی پێشکەوتوو، لەڕووی مرۆییەوەو دواکەوتوو لە ئابووری دا.

سێیەم: پێشکەوتوو لەڕووی مرۆییەوە، لە هەمان کاتدا لەسەر ڕێچکەی پێگەیشتنە لەڕووی ئابوورییەوە.

چوارەم: جیهانێکی دواکەوتوو لەڕووی ئابووریو مرۆییەوە.

ئەگەر سەیری حاڵەتی یەکەمو دووەم بکەین، حاڵەتی یەکەم بەڵگەیە لەسەر جیهانی پێشکەوتووی خۆرئاوا، هەرچی حاڵەتی دووەمە ئاماژەیە بۆ وڵاتانی دواکەوتووی جیهانی سێیەم.

ئەوەشی کە پەیوەستە بە جیهانی پێشکەوتووی ڕۆژئاواوە کە هەموو هۆکارەکانی پێشکەوتنو تەکنەلۆژیای نوێی بە دەستهێناوە، کە بێگومان هەموو هەوڵو تواناکانی خۆیان دەخەنە گەڕ بۆ پاراستنی دەسکەوتەکانیانو زیاتر بەرەو پێشەوە هەنگاونان، هەروەك لەم پێناوەدا بەردەوام لە هەوڵدان بۆ گەشەپێدانی توانای زانستی تاکەکانی کۆمەڵگاکانیان، ئەوەشی یارمەتیدەری ڕۆژئاوا بوو تا بە خێرایی هەنگاو هەڵبگرێت، ئەوەیە کە تاکی خۆرئاوایی بەردەوام لە هەوڵی داهێنانو نوێگەریدایە. بەڵام بە نیسبەت جیهانی دواکەوتوو کە بە وڵاتانی جیهانی سێیەمیش ناو دەبرێن، کۆمەڵێك کێشەو کۆسپو تەگەرەیان لە بەردەمدایە کە ڕێگە نادات بەرەو پێشەوە هەنگاو هەڵگرێت، کە ئەم کۆسپانە بۆ وڵاتانی دواکەوتوو وەك نەخۆشییەکیان لێهاتووە، گرنگترین ئەو هەڕەشەو مەترسییانەی کە لە داهاتوودا ڕووبەڕووی مرۆڤایەتی دەبنەوە ئەمانەن:

یەکەم: هەژاری: گرنگترینی ئەو مەترسیانەیە کە لە داهاتوودا ڕووبەڕووی گەشەپێدانی مرۆیی وڵاتە دواکەوتووەکان دەبێتەوە، کە داتاو سەرژمێرییەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە نیوەی دانیشتووانی جیهان لە بەردەم مەترسیی هەژاریدان، لەوانە (٣/١) ملیار مرۆڤ لە ژێر هێڵی هەژاری دا ژیان دەبەنە سەر، ئەمە لە کاتێکدایە کە جیهان ڕێژەی چینی مامناوەندی زۆر کەمە، دانیشتووان بە شێوەیەکی گشتی، یان زۆر هەژارن، یان زۆر دەوڵەمەندن، گرنگترین ئەو قەیرانانەی کە لە داهاتوودا ڕووبەڕووی جیهانی سێیەم دەبێتەوە ئەوەیە کە دەوڵەتانی جیهانی سێیەم کێشەی زۆریان دێتە ڕێ، لەڕووی دابینکردنی بژێویو پێداویستییەکانیان.

دووەم: نەخوێندەواری: گرنگترین نەخۆشییە کە بەردەوام هەڕەشە لە وڵاتانی تازە پێگەیشتوو، دەوڵەتەکانی جیهانی سێیەم دەکات، لەگەڵ ئەوەی دانیشتووانی ئەم وڵاتانە ناتوانن پێداویستییە سەرەکییەکانیان دابین بکەن لە خواردنو جلو بەرگو سووتەمەنی، هەمان کات گەورەترین هەڕەشەی تر کە ڕووبەڕوویان بووەتەوە بڵاوبوونەوەی نەخوێندەوارییە لە ناو چینو توێژەکانی دانیشتوواندا، هۆکاری بڵاوبوونەوەی نەخوێندەواری زۆرە لەوانە کەمی داهاتی وڵات، کە سەرەنجام کاریگەری لەسەر هەموو وەزارەتەکان بە جێدەهێڵێت، لەوانەش وەزارەتی پەروەردە لەبەر ئەوە وەزارەت پەکی دەکەوێت لە گرنگیدان بە بواری پەروەردە بەو شێوازەی کە خۆی دەیەوێتو پلانی بۆ داناوە، هەروەك هەژاریو شەڕوماڵوێرانی پاش جەنگەکان هۆکارێکی دیکەن کە میللەتانی ئەو وڵاتانە گرنگی بە خوێندن نەدەن. بەڵام لە ئێستادا هەنگاوی باش نراوە بە ئاراستەی چارەسەرکردنی کێشەی نەخوێندەواری لە وڵاتانی تازە پێگەیشتوودا، یەك لە دروشمەکانی ئەمریکا لە بواری پەروەردەدا ئەوەیە کە خوێندن دەبێت بۆ هەمووان بێت، هەروەك لە ڕێکخراوەکانی بواری پەروەردەی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان ڕۆڵێکی باڵایان هەبووە لە کەمکردنەوەی دەرئەنجامەکانی ئەو گرفتە کە بێگومان هەڕەشە لە مرۆڤایەتی دەکات.

سێیەم: پیسبوونی ژینگە: ئەمە گرفتێکی دیکەیە کە هەڕەشە لە تەندروستی میللەتان دەکات، کە پەیوەستە بەو ڕاپەڕینە پیشەسازییەی کە وڵاتانی پیشەسازی ئەنجامیان داو بە هۆیەوە خۆیان پێشکەوتنێکی یەکجار گەورەیان بەدەست هێنا، هەمان کات گەورەترین مەترسییان ڕووبەڕووی وڵاتانی جیهانی سێیەم کردەوە، بە هۆی پاشماوەی زیانبەخشی کارگە پیشەسازییەکانی ئەوانەوە وڵاتانی جیهانی سێیەمیان ڕووبەڕووی پیسبوونی ژینگە کردەوە، هەمان کات ئاشنا نەبوونی ئەم وڵاتە تازە پێشگەیشتووانە بە چەمکی ئاسایشی ژینگەیی کە ئەویش بریتییە لە پاكو خاوێن ڕاگرتنی ژینگە بە هەموو جۆرەکانییەوە بەشێوازێك کە پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا کار نەکاتە سەر پیسبوونی دەوروبەرو دابینکردنی پێداویستییەکان لە سەرچاوەیەکی پاكوخاوێنەوە، هەروەك دووبارە پاکژ کردنەوەی بەکارهێنراوەکان لە ڕێی ئامێرەوە وەك پاکژکردنەوەی ئاوی زێرابو دووبارە بە کارهێنانەوەی کە ئەمەش کاریگەری زۆری هەیە لەسەر پیسبوونی ژینگە، کە دەرکەوتووە دووبارە بەکارهێنانەوەی ئەو شمەکە بەکارهێنراوانە زیانێکی زۆر بە تەندروستی مرۆڤ دەگەیەنێت، باشترین بازاڕێکیش بۆ ساغکردنەوەی ئەم شمەکانە وڵاتانی جیهانی سێیەمە!

سەرچاوە: لە ئینتەرنێتەوە

وشیار عەلی - پێنجوێن

# هەناسەیەك بۆگۆڤاری بڕیار

بەناوی خوای بێ هاوتا

سڵاو بڕیار، سڵاو گۆڤارە نەخشینەکەی وڵات، لە یەکەم دڵۆپتەوە تاپێش ماڵئاواییت سڵاو، لە سەرەتاو نێوەڕاستو هەتا کۆتاییت هەر سڵاو..

سەرپاك وشەکانت جوانن بۆ برسێتی مێشکی ماندوو ڕازاوەترین خوانن، پەڕە بە پەڕەت سەنگینە، ڕازاوەو وردوشیرینە، تاوێك دەتهێننە پێکەنین، تاوێکیش گریان، بڕیارەکەم لەو ڕۆژەوە بڕیارمدا بڕیارمبێ، هەتادووواین وشەو پەیڤت هەریارمبێ، هێندە هۆگرتبووم ئێستا لە خوێندنەوەی ئەم ژمارە لێنابمەوە چاوەڕێی ئەویتردەکەم، خۆشم دەوێیت لەبەرگەوە هەتا بەرگت، پەڕە بە پەڕەو دێڕ بە دێڕت، پڕن لە مرواریو لە زێڕ، زێڕی وشە، زێڕی واتای ژیانەوە، لە هەنسکی گریانەوە، دەست پێدەکەن زۆر بە جوانی، پڕ پڕ لە ڕازی ئینسانی، پێناسەت ناکرێ بڕیار، دڵنیاشم منی خوێنەرت، زیاتر چێژت لێ وەردەگرم، لە نووسەرو ئەندامانت، بۆیە دەستم بە دامانت، لێم ون نەبیت لە ناکاوا، لە هەر کوێبیت دەتبینمەوە، لەبەر زەرکەفتی هەتاوا، یەکەمجار ڕەمەزانی پار، کە تۆم بینی دەستم دایە باڵای وشەت، هۆشم دایە دێڕو پەڕەت، بە خوێندنەوەت گیانم دەلەرزی بە یەك کەرەت، مووچڕکە بەسەرما دەهات، لە جوانی گوفتاری ڕەهات، هەتا دەهات زیاتر ڕۆدەچووم بەناختا، بە نێوچەمە نزارو باختا، وائەمساڵیش ڕەمەزان ڕۆیشت، هەر لە گەڵتام چاك بزانە، لێت بێزارنابم هەتا مردن، چونکە وشەکانت وردن.

بڕیارگیان، تۆفێرت کردین ئارامگربین، لەسەرخۆبین، هەمیشە باوەڕ بەخۆ بین، هەست بە نائومێدی نەکەین، قانع بینو ورە بەرنەدەین، بەختەوەری بە دەست بێنین، لە خۆپەسەندی وازبهێنین، بەختەوەری بەحجل نییە، گەورەییو خۆشبەختی ژیان بە ناوبانگی زل نییە، فێرت کردین پردی خۆشویستن دروستبکەین. برای یەك بین هاوڕێیەکی بە ئەمەك بین، وەك یەکیش بیرنەکەینەوە، بۆ ماڵ نەگەڕێینەوە، تادیارییەك نەبەینەوە، فێرت کردین ژیان خۆشە، هەتا ڕۆژە تێبکۆشە، بەرهەمی ڕۆژ شەو بینۆشە، فێرت کردین ڕێزی دایكو باوك بگرین، دووهێندەی پێکەنین بگرین، فێرت کردین بۆ مندالٚ بخوێنینەوە، بۆ ڕووناکی با مۆمێك بتوێنینەوە، فێرت کردین کار گەورەترین دەرمانە، لە کاریش بیربکەینەوە، بەڵام ئارەزوومەندانە، فێرت کردین یارمەتی پێویست بە دەنگەدەنگ ناکات، تا دەتوانین ڕێز لە تەمەنو کات بگرین، فێرت کردین چۆن چێژ لە ژیان وەربگرین، ئەگەر هیچمان لە دەستنایە باسارێژ بکەین یەك برین.

فێرت کردین، خۆشەویستی ڕاستەقینە، ئەوەی مرۆڤ لە نێو دەبات ژەنگی ڕق لێبوونو قینە، فێرت کردین خێزانی بەختەوەرمان بێت، بەختەوەری لەناخدایە گەرتێیدا بێت، بە هیچ هێزێك دەرنایە، بە پارەوپوول وەبەرنایە، فێری کارگێڕیمان دەکەیت باشترین هەڵسوکەوتو کار، لە فەرمانگەو بازاڕوشار، باشترینی بەڕێوبەریش دەناسێنی، بە وتەی جوان سەری گشتمان دەماسێنی، فێرمان دەکەیت بازاڕ چۆنە، کاڵاو نرخو جۆری ڕیکلامو فرۆشتن، هەتا بەوە دەگات بڵێیت خۆ دووربگرن لە خۆکوشتن.

بڕیارگیان چیت لێباسبکەم، داخۆ فێری چیمان ناکەیت؟؟

لە کام دێڕو وشەت بدوێم؟ کام بابەتت سەرنجی دڵ ڕاناکێشێ؟ هیواخوازم لەگەڵمان بیت، تاتەمەن دەچێتە پێشێ، ماوە بڵێم خۆشم دەوێیت وەکو دایکی گۆڤارەکان خۆشم دەوێیت.

لەگەڵ ڕێزوسوپاسو دەستخۆشی زۆرم، بۆ تەواوی ئەندامو کارمەندو بەشداربووانو ماندووبووانی ئەم گۆڤارە جوانە. (لەخوای گەورە داواکارام هەرسەرکەوتووبن). سوپاس...

# ژیان بێ نرخە مەگەر خۆمان نرخی پێ بدەین

کامیار عومەر سلێمان

لەوانەیە زۆرێکتان کاتێك چاوتان بەناونیشانی ئەم بابەتە دەکەوێت، تووشی سەرسوڕمان، یاخود جۆرێك لە گومان بن، بەڵام من لە ڕێگەی ئەم وتەیەی (لین یوتانگ) کە دەڵێت: (بۆ ئەو کەسەی کە دەڵێت هیچ شتێك گرنگ نییە، بەڕاستی هیچ شتێك گرنگ نییە) دەچمە نێو بابەتەکەوەو هەوڵ دەدەم ناونیشانی ئەم بابەتە بۆ بەڕێزتان ڕوون بکەمەوە.

ژیان خۆی لە خۆیدا بێ نرخە، بوونی ئێمە لەم جیهانەدا بەو مانایە نییە کە ژیان بایەخێکی هەیە، سەرەنجام ئەوە ئێمە خۆمانین کە دیاری دەکەین مانەوەمان لەم ژیانەداو لەم هەسارەیەدا بۆ ئێمە خێرو خۆشیو بەختەوەری بێت، یان زیندانێك لە داماوییو ئازارو بێ هیوایی.

ئەگەر (نەوزاد) کە لە لێواری خۆکوژییدایە لێمان بپرسێت ئەم هەموو هەوڵو تەقەلایە چ مانایەکی هەیە؟ ژیان ئەو هەموو پەلە قاژێیە ناهێنێت، (ئەمە ژیانی ڕاستەقینەی ئەوە)، واقیعێکە کە خۆی دروستی کردووە لەم ڕووەوەیە کە بەڕاستی ژیانی ئەو بێ بایەخە، ناتوانین کارێکی ئەوتۆشی بۆ بکەین، کاتێك ئەو نایەوێت هەنگاوێگ بەرەو خۆشیو چالاکی هەلگرێت، ئێمە چۆن دەتوانین ژیانی لە لا شیرینو خۆش بکەین؟ ڕەنگە ئێوە بە پیاسە کردن لە لێوار دەریایەکی زیخەڵاندا چێژ وەربگرن، ڕەنگە بەسەیر کردنی فیلمێکی کۆمیدی دڵخۆش بین، ڕەنگە بە کڕینی ئۆتۆمبیلێکی مۆدیل بەرز، شادمانو خۆشحاڵ بین، پێدەچێت بە ..بە.. هتد.

تەواوی ئەم خۆشییانە بۆ (نەوزاد)یش ئامادەیە، بەڵام ئەمە پەیوەندی بە خۆیەوە هەیە کە چێژیان لێ وەردەگرێت، یان نا؟ سەرەنجام پێویستە هەر یەکێك لە ئێمە بڕیار بدەین تەرکیز بخەینە سەر ئاگایی خۆمان، بە شێوەیەك کە بۆ هەر گوندێك دەچین، هەر جارێك کە لە گەرماوێکدا خۆمان دەشۆرین، هەر سێوێك کە دەیخۆین، هەر قسەیەك کە دەیکەین، هەر ڕێگەیەکی دوورو درێژ کە دەیبڕین، هەموویان ئەزموونێکی نوێن بۆ ئێمە، نەوەك دووپات بوونەوەی ڕووداوەکانی ڕابردوو.

ژیان بێزارو ڤێزەون نییە، بەڵکو بێزاری لە خەڵکانێکدایە کە بەدڵێکی مردوو لە پشت چاویلکە لێڵو چڵکنەکانیانەوە لە ژیان دەڕوانن، خەڵکانێك کە پێیان وایە ژیان هیچ کات خۆشی بۆ ئەوان پێ نەبووەو نابێت، کەسانێکی زۆر لە تەمەنی بیستو پێنجساڵیدا دەمرن، بەڵام تا تەمەنی حەفتاو پێنج ساڵی نانێژرێن، جەستەیەك کە تەنها دەخواتو دەخەوێت، جەستەیەکی بێ گیان کە جێگەی زیندوویەکی پڕکردووەتەوە. ئەمە وەك نهێنییەك وایە کە بۆچی هەندێك کەس دەڕواننە هەر شوێنێك جوانیو دیمەنی دڵڕفێن دەبینن، لە کاتێکدا ئەوانی تر لەبەر چاویلکە لێڵ و پیسەکانیان، لەبەر تارماییە ڕەشەکانی بەر چاوییان ئەم جوانییە نابینن.

تا ئەم ساتە وەختە ئەگەر چی چێژتان لەم جوانیانە بینیبێت، ئەمڕۆ دەتوانن بڕیار بدەن کە چێژی زۆرتر وەربگرن، بۆ ئەوانەش کە تائێستا ئەم جوانییەیان نەبینیووە، دەتوانن پاش خاوێنکردنەوەی چاویلکەکانیان هەموو جوانییەکان ببین، ئەمڕۆ کاتی هەڵبژاردنە، ئەمڕۆو هەموو ڕۆژێك.

# گوڵدانی عەشق..

ئا: ئاوارە عەلی مستەفا

### کام عەشق؟

مرۆڤەکان ئەو تروسکاییە بچوکانەن کە یەك دەگرن، شوعلە دەبەخشنە بوونو دەیجوری لێکترازانو ڕقەبەرایەتی کپ دەکەنەوەو فێری ئاوێتەبوونی دەکەن، ئەو سیما بچکۆلانەن کە لە وێنەی ڕەگی بچووکەوە لە درەختی بوون سەریان دەخەنە دەرەوە تا ئەوەی گوڵدانێك دروست بکەن، یان ئەوەتا وەك دڕکێك بە پاڵ گوڵەکانەوە ڕقی خۆیان بۆ گوڵ نێژان دەرخەنو دروشمی گوڵپارێزی جاڕدەن.

مرۆڤەکان ئەو دڵۆپە ئاوانەن کە یەك دەگرن تەپۆڵکەکانی بەردەمیان نغرۆ دەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا جوانترین دیمەنی سروشت دروست دەکەن، ئەو قەترە هەنسکانەن کە لە قوڵایی دڵەوە بە نێو کۆشکی حوزن تێدەپەڕن کەچی کە ڕیز دەگرن تابلۆی خۆشەویستی دەکێشنو لە پێشانگای نەمراندا دەیکەنە دیاری ئازیزانیان، ئەو درەختانەن کە تەنها بە چاوتروکانێك وشك دەبنو وەرزی خەزان دەیان مرێنێت، ئیدی کە پەرش دەبن نسێی خۆیان دەتاشن بە جۆرێ خەزان ڕادەکات، گەر گەڵاکانیشیان بوەرێنێت ئەوان زووتر چرۆی تازە بە دیار دەخەن، ئەو ئەکتەرەن کە لە درامای زەمەن ڕۆڵی نیگار کێشێك دەبینن، کە لە لقو گەڵای درەختەکان فڵچەیەك دروست دەکەنو لە گڵی زەویو دڵۆپەی ئاوو خونچەو دڕکی گوڵو فرمێسکی قەتیسماودا نیگارێك بە نێوی (گوڵدانی عەشق) وێنا دەکەن.

لەم بەشەدا دەمەوێت ئەوە بخەمە ڕوو کە مەبەست لەم زنجیرە باسەدا بە ناونیشانی (گوڵدانی عیشق) دەرخستنو وروژاندنی کۆمەڵێك بابەتە کە پەیوەندییان بەو لەمپەرو دڕکانەوە هەیە کە بەربەستن لە بەردەم سەرکەوتنو دروستکردنی ژیان، لە شێوەی گوڵدانێکی بۆنداردا، ئەگەرنا کەم تازۆر پەیوەندی بە عیشقەوە نییە بە مانا بڵاوو زانراوەکەی، تەنها ئەوە نەبێت کە خودی عەشقیش بۆخۆی لەمپەرێکی بەردەم پرۆسەی دروستکردنی ژیانێکی سەرکەوتوانەیە کە جێگەی هەڵوەستە لەسەر کردنە، شایستەی ئەوەیە بیکەینە دەروازەیەك بۆ ئەڵقەکانی داهاتوو، هەر بۆیە لەم بەشەی یەکەمدا بە کورتی ئاماژەی بۆ دەکەینو دەڵێین:

تەنها مرۆڤە کە دەتوانێت ژیان بدوێنێتو پێی بڵێت: من پەی بە نهێنییەکانت دەبەم، هەرچۆنێك بمەوێت وابۆخۆم فەراهەمت دەکەم، بەڵام پەیبردن بە بوون کاتێك دەگات بە پایەو نرخی ڕاستەقینەی خۆی کە مرۆڤ عاشق بێت، شارەزایی ناواخنو ناوەڕۆکی عەشق بێت، بتوانێت لەگەڵ عەشق بگوزەرێت، تەنانەت کاتی ژوان لەگەڵ مەعشوقەکەشیدا وابەستەی بێت نەك تا ئەوەی پێی دەگات، دوورتر لەوە دەبێ عاشقی زەمەنی عەشقیش بێت، عەشقێك کە دوای نەمانی گەردونیش هەربەردەوام بێتو لە جوغزێکی تردا درێژە بە عشق بدات، بەڵام کام عەشق؟ کام خۆشەویستی؟ لە کام دونیا؟ چ درێژەپێدانێك؟ چ جۆرە گوڵدانێك؟ ئەمە ئەم پرسیارانەن کە لە دوای خوێندنەوەی ئەم بابەتەو بابەتەکانی تری گۆشەی (گوڵدانی عەشق) دەبێت تۆی خوێنەر وەڵامیان بدەیتەوە.

عەشقو خۆشەویستی مەردومەکان بۆ هاوتای خۆیان لە دوو خاڵ بەدەر نین:

١- خۆشەویستی جەستەیی (العشق الجسمانی): (کە بریتییە لە: مامەڵەکردن لەگەڵ ڕووکاری مرۆڤو خۆشییە

جەستەیی‌و ناهەمیشەییەکان، لە وێنەی جوانی، بالاّ بەرزی، دەوڵەمەندی، ناوداری...هتد. ئەمەیان خۆی دەمرێت و ئالودەبووانیشی لەگەڵ خۆیدا دەبات، لەمپەرە لە بەردەم سەرکەوتن، تەنانەت دوای گەیشتن بە مەتلوبیش لە ناو دەچێت، هەمیشە پێش تەواو بوونی زەمەنی تاکەکانی هەر لەم گێتییەدا خۆی تەواو دەبێت!

٢- خۆشەویستی دەروونی، یان ڕۆحی، (العشق النفسانی): (مامەڵە کردنە لەگەڵ ڕۆح‌و دەروونی مرۆڤەکان، ئالوودەبوونە بە پڕەنسیپە سروشتییەکانی کەسی بەرامبەر، حەزبوونە بە غەیری هەستپێکراوە جەستەیی‌و کاتییەکان، وەك دینداری، ڕەوشت بەرزی، هێمنی.... هتد، ئەمەشیان گەر نەگات بە مەتلوب کوشتنێکی هێمنانەیە، بکوژی خولیا تازە پێگەیشتووەکان، زیندە بە چاڵی تاکەکانە، هەرچی بێ ئەمەشیان لەگەڵ ئەکتەرەکان دەچێتە ژێر گڵ‌و شوێنەواری نامێنێت!

لە ئەگەری نەگەیشتی کەسەکە بە ڕەگەزی بەرامبەر بە هەردوو حاڵەتەکەوە (خۆشەویستی جەستەیی‌و خۆشەویستی ڕۆحی) مرۆڤ تووشی دارووخانی هێزی بڕیاردان‌و پەراگەندەبوون‌و خەمۆکی‌و بێهیوایی‌و ...هتد، دەبێت، بەڵام ئەشێ مرۆڤ هەروا بەردەوام بێت؟ ئەشێ عەشقێك نەبێت تاك بتوانێ لە هەردوو دونیا بیگوزەرێنێت؟ نا بێگومان دەبێت بارودۆخێك بۆ خۆت بخوڵقێنیت کە ڕۆڵی ئەم خۆشەویستییە دڵتەنگانەیە بات‌و لە پاڵ دڕکەکانی چڕۆی گوڵت بۆ دەرخات، دەبێت عەشقێك هەبێت تا زەمەنی گەیشتنت بەم عەشقە دڵنەوایی‌و متمانەت پێببەخشێت، ئەویش ئەو عەشقەیە کە شاعیر لەبارەیەوە دەڵێت:

إذاكان حب الهائمين من الورى
بليلى وسلمى يسلب اللب والعقلى
فماذا عسى أن يفعل الهائم الذي
سرى قلبه شوقا إلى العالم الاعلى

واتە: گەر خۆشەویستی مرۆڤەکان بۆ لە یلاو سەلما عەقڵ‌و ئاوەزو بیروهۆش لە دەست بسەنێت، ئەی دەبێ ئەو کەسە چی بکات کە دڵەکەی باڵە فڕکێی کردووە بۆ خۆشەویستی دونیای سەروو، (خۆشویستنی خوا)!

تاکە خۆشەویستێك بتوانێت دەستبارت بگرێت‌و لە نەخشاندنی گوڵدانی ژیانت یارمەتیت بدات! خۆشەویستێك لە ناو گۆڕیشدا مۆمی وەفاداریت نیشان بدات! خۆشەویستێك لەو دونیاش دەستی بەخشندەییت بۆ ڕابخات! تەنها(خۆشویستنی خودایە)!

بۆیە هەر ئێستا بڕیاربدەو کۆت‌و بەندی ئەو عەشقە بشکێنە کە بەندە بۆی هێناویت، بە خۆشەویستی مەعبودەکەت دروستکردنی گوڵدانی عیشقت دەسپێبکەو بڵێ:

خۆزیا تۆم لاشیرین دەبووی‌و تۆم خۆشدەویست با هەر دونیا تاڵ‌و ناخۆشبوایە، خۆزیا تۆ لێم ڕازی دەبوویت‌و با خەڵکی لێم توڕەبوونایە. خۆزیا نێوان من‌و تۆ ئاوەدان‌و خۆش دەبوو، با نێوان من‌و خەڵکی وێران‌و ناخۆش بووایە.

گەرخۆشەویستی تۆم هەبێت ئیدی هەموو شتێك ئاسانە، سەرتاپا ئەوەی لەسەر خۆڵدایە خۆڵە)!

مەبەست لێرەدا مرۆڤە کە لە بنەڕەتدا لە خۆڵ دروستکراوەو خۆیشی لەسەر خۆڵ دەژیت).

بێگومان ئەو سا دەتوانیت دەستبکەیت بە سەرکەوتن بەسەر یەکەم پلیکانە بەرەو لوتکەی شادی‌و سەرکەوتنت دەبات، بۆ دواجار ماڵئاوایی لە شکست دەکەیت‌و کۆشکی خەمەکانت نەفرین ڕێژو خاپور دەکەیت‌و ئیتر لە وێ یەکەم هەنگاوی دروستکردنی گوڵدانەکەت دەست پێدەکەیت!

لە یادی نەکەیت لە کۆتاییدا خۆت سەرپشکیت کام عیشقت دەوێت؟ ئەوەی کە ئازارت دەدات، یان ئەوەی دڵنەوایی‌و کامەرانیت بۆ دەهێنێت؟

کام گوڵ دەخەیتە گوڵدانەکەت؟ هی مرۆڤ کە زوو ئەوەرێ‌و دەتمرێنێت، یان هی مەعبودو بەدیهێنەرەکەت کە ژیانت پێ دەبەخشێت؟!

# پایەکانی گەشەپێدانی کەسێتی

و.زاهیر زانا

هەموو مرۆڤێك ویستێكی هەیە، خواستی مرۆڤی ئیجابی گەشەكردنی بەردەوامە كە بە خودی خۆی دەست پێدەكاتو هەمیشە لە سەری بەردەوام دەبێت، لەبەرئەوەی لە هەستو نەستیدا چەسپاوە كە گۆڕانكاری لە خودی مرۆڤەوە دەست پێدەكاتو بە گۆڕانی ئەو هەموو شتێك دەگۆڕێت.

هەر بۆیە كاتێك مرۆڤ زانی هیچ گیروگرفتو بەربەستێك ڕێگەی لێناگرێتو پیریو كاردانەوەكانی ڕۆژگار كاریگەریان لەسەر نابێت، ڕۆژو شەو كاردەكات بۆ جێبەجێكردنی بنەماكانی گەشەپێدانی خۆیو خستەنەگەڕی تواناكانی، تاوەكو ببێتە هێمای سەركەوتنو بەرهەمداربوون، بێگومان ئەویش بەجێبەجێكردنو پەیڕەویكردنی ئەم بنەمایانەی لە خوارەوە باسیان دەكەین:

١- شانازی بكە بە ئیجابی بوونتو دووربە لە تەواوی ماناكانی لە خۆبایی بوون، كاتێك هەست بە لاوازی خۆت دەكەیت لە بەرامبەر كۆسپەكاندا ئەو شتانە بژمێرە كە بەدەستت هێناونو لەسەر لاپەڕەكانی دڵت بیان نەخشێنە، با هەمیشە لەبەر چاوت بن.

٢- كاتە بەتاڵەكانت بەشتی بەسود پڕبكەرەوەو پەیوەستبە بە بەرنامەیەكی هاوسەنگەوە، تێكەڵی بەردەوامت هەبێت لەگەڵ ئەوانەی خۆشت دەوێنو بەشدارن لە گەشەسەندنتدا، بەم شێوەیەش هەمیشە وزەی نوێ وەردەگریت.

٣- زۆر پێویستە خۆت خۆشبوێت، بەڵام دوور لە دەردی بەخۆ سەرسام بوونو خۆپەرستی، ڕێزی خودی خۆت بگرەو بنەماكانی خاكی بوونو ڕاخستنی باڵی میهرەبانیت بیرنەچێت.

٤- ئەوە دەرببڕە كە لە ناختدایە، بەڵام ڕەچاوی واقیعو ئاستی زانیاری بەرامبەر بە، ئاگاداربە نەكەویتە تۆڕی كاردانەوەوە.

٥- سوپاسی ئەوانە بكە چاكەیان لەگەڵدا كردویتو ڕێزی ئەوانە بگرە كە ڕێنماییو ستایشیان كردوویت.

٦- با دۆزینەوەی خودی خۆت گەورەترین پڕۆژەی ژیانت بێت، چونكە لە ڕێگەی ئەوەوە دەتوانیت بەهرەكانت بدۆزیتەوەو كەمو كوڕییەكانت چارەسەربكەیتو نەخشەی ئایندەشت بكێشیت.

٧- هزرو بیرت بپارێزە لە بیروباوەڕە سلبییەكانو ڕێگربە لە شەپۆلی ڕەشبینی، ڕەشبینی ئاگرێكە خەرمانی كاركردن دەسوتێنێت.

٨- خوای گەورە ڕێزی لێ ناویت، بۆیە هەرگیز لەو ئاستی ڕێزە دامەبەزە بە هۆی گرێی هەست بە كەمی كردنو لاوازی متمانە بەخۆبوون.

٩- ڕەخنە بۆ بە خۆداچوونەوەو بەرەوپێشچون لە خۆت بگرە، نەك بۆ خۆ ڕووخاندنو دەستەوسان بوون.

١٠- دواخستنی كارەكان كارێكی ئاساییە ئەگەر توێژینەوەی لەسەر كرابێتو لە چوارچێوەی مرونەو نەخشەدابێت، بەڵام ئەگەر لە تەممەڵیو پشتگوێخستنەوەبێت، ئەوە خەریكی خۆت هەڵدەخلەتێنیو زەرەرمەند دەبیت، باش ئاگاداربە!

١١- هەموو بەیانییەك بڕیاربدە كە بەردەوامبیت لەسەر چاكەو بەرەو پێشچونو گەشەسەندن.

١٢- پێویستە سوود وەربگریت لە ئەزمونی كەسانی تر، تاشوێنی سەركەوتووەكان بكەوینو خۆمان لە ڕێگەی شكستخواردووەكان بپارێزین، بیرت نەچێت تۆش خاوەنی ئەزموونی تایبەتی خۆتی بەكاری بهێنەو ئەزمونی كە.

١٣- نرخی هەموو كارێك بزانە كە ئەنجامی دەدەیت، بچوك بێت، یان گەورە، هەربۆیە نرخی زەردەخەنەیەكیش بە كەم مەزانە.

١٤- بزانە كەس ناتوانێت بچێتە ناختەوە بەبێ ڕەزامەندی خۆت! ئاگاداری ئامێری وەرگرتنەكەت بەو لە ڕادەی وردیو هەستیاریو گونجانی ئاگاداربە لەگەڵ ویستەكانتدا.

١٥- هەڵە ئەوەیە دەست پێ نەكەیت، نەك هەڵە نەكەیت، لەبەرئەوەی داهێنان نایەتو دروست نابێت بە بێ هەڵە، لەبەرئەوە وشەی شكست لە فەرهەنگی ژیانتدا دەربهێنە.

١٦- ئەم بنەمایانە هەموو هەفتەیەك جارێك بخوێنەرەوە، بە كرداری جێبەجێی بكە، چونكە بەرهەم بە بەدواداچوونو جێبەجێكردن دەبێت.

# پیاوو کەڵەشێر...

پیاوێك هەبوو.. وای دەزانی دەنکە گەنمێکە. بەگوێرەی ئەم تێڕوانینە نامۆیەی کە بەرامبەر خۆی هەیبوو.. وای لێ هاتبوو.. زۆر دەترسا، کەڵەشێر لێی نزیك ببێتەوەو ئەو کەڵەشێرە ئەو بە خواردنی چەوری خۆی بزانێتو بیخوات. ئیدی هەر کە لە دوورەوە کەڵەشێرێکی بەرچاو دەکەوت.. سامی لێ دەنیشتو بە هەڵەداوان ئەو جێگەیەی جێدەهێشتو ڕای دەکرد. پاش ئەوەی خێزانو منداڵەکانیو دۆستو برادەرانی، لە بەرامبەر ئەم بارودۆخەیدا سەرسام بوون.. سەرەنجام بڕیاریان دا، بیبەن بۆ لای پزیشکێکی دەروونی.. سا بەڵکو لە گۆڕینی ئەو لە خۆ بەکەم ڕوانینەی هەیەتی، سەرکەوتوو بێت.

بەڵێ پزیشکە شارەزاکە، لە چارەسەرکردنیدا سەرکەوتوو بوو.. پیاوەکەش باوەڕی بەوە هێنا.. کە ئەو مرۆڤە.. دەنکە گەنمێك نییەو بە ئاسانی بخورێت.. دۆستو نزیکەکانیشی ئەوەندە خۆشحاڵ بوون، کە هەر لەباس نایەت.. بۆیە زۆر زۆر سوپاسی پزیشکەکەیان کرد. پاشان بە هاوەڵی هاوەڵەکەیان، بە خێر لای پزیشکەکە ڕۆیشتن.. هەرکە گەیشتنە سەر شەقامەکە.. کەڵەشێرێکی بینی، بە باڵ فشکردنەوە ڕێی دەکرد. لە ترساندا هاوارێکی لێ بەرز بووەوە، هەروەك نەریتی پێشووی- بەوپەڕی توانای خۆی ڕای کرد. پاش ئەوەی چەند چرکەیەك، هاوەڵەکانی لەبەر ئەم کارە لە جێی خۆیان ڕاوەستانو حەپەسان.. بە دوایدا ڕایانکرد. پاش هەوڵێکی زۆر ڕایانگرت.. بە نارەزاییەکەوە پرسیاریان لێکرد: ئایا چوویتەوە سەربارەکەی جارانت.. کە واتدەزانی، دەنکە گەنمێکیتو بەس؟

یەکسەر لە وەڵامیاندا گوتی: پزیشکەکە باوەڕی پێ هێنام، کە من مرۆڤم.. بەڵام کێ ئەو باوەڕەی لای کەڵەشێر دروست کردووە.. کە من دەنکە گەنم نیم؟!

ئەم چیرۆکە وا دەردەکەوێت.. زۆرتر لە نوکتەو قسەی خۆشەوە نزیکە.. بەڵام بە داخەوە، ڕەنگدانەوەی بارودۆخی زۆرێکمانە.. ئەوانەی تێڕوانینیان بەرامبەر بە خۆیان نارێکە.. ئەوا ئەو تێڕوانینەیان، لەسەر ڕێی سەرکەوتنیان.. بووەتە بەردو بەربەستێکی گەورە. بۆیە پێم خۆشە پێت بڵێم.. هەرگیز ناتوانیت ژینت بگۆڕیتو ناشتوانیت بگەیتە ئەو بارودۆخەی دڵخوازی خۆتە.. مەگەر تێڕوانینت بەرامبەر بەخۆت، لەگەڵ خەونەکانت پێك بێنەوەو بگونجێن.

سا بێ تێڕوانینێکی لەبار بەرامبەر بە خۆت.. ئەستەمە - لە بڕینی ڕێ تاکۆتاییەکەی - سەرکەوتووبیت.. ئەویش ئەگەر دەستت پێ کرد. دەیسا بارودۆخی ئێستەت هەرچۆنێك بێت.. لە ناخی خۆت بڕوانە.. بە دوای ئەو شتەدا بگەڕێ کە دەتوانیت بیهێنیتە دی..

چاك وایە وتەی سێ ناودارت، بخەمە بەر چاوی تۆی ئازیز:

گومانی خراپ بە خۆ بردن.. سەختترینی ئەو زیانانەیە، کە دەشێت تووشی مرۆڤ بێت. گۆتە.

زۆرجار داخەرجاندنی نرخی ناخ.. گەورەترین خاڵی لاوازی مرۆڤایەتییە. دەیڤد شوارتز.

هەستمان بەرامبەر بە خۆمان، بە شێوازێکی یەکلاکەرەوە، کار لە هەڵسوکەوتمان دەکات. ناتاییل براندن.

ن: وحید مهدی

ل: ڕۆبێرت کایۆساکی

کورتکردنەوەو وەرگێڕانی: عادل شاسواری

# نهێنی دەوڵەمەندبوون
# لە لای باوکی دەوڵەمەندو باوکی هەژار

پێشەکی/

کتێبی (باوکی دەوڵەمەندم، باوکی هەژارم) کە لە ساڵی (٢٠٠٠)دا بڵاوکراوەتەوەو نووسەرەکەی (ڕۆبێرت کایۆساکی)یە، کایۆساکی- ئەمریکاییەکی بە ڕەچەڵەك ژاپۆنییە، ساڵی (١٩٤٧) لە دورگەی هاوای لە ئەمریکا لە دایکبووە، ١٨ کتێبی نووسیوە کە سەرجەمیان (٢٦) ملیۆن کۆپییان لێ فرۆشراوە لە سەرتاسەری جیهاندا.

ڕۆبێرت پیاوێکە لە سفرەوە دەستی پێکردووە، سەرمایەگوزارەو وانەبێژی گەشەپێدانی مرۆییەو ملیۆنێرێکی دوای ئیفلاسکردووە. چەندین کۆمپانیای سەرکەوتووی دامەزراندووەو دوای سەرکەوتنیان فرۆشتوونی، پاشان زیاتر لە جارێك ئیفلاسی کردووە، تا وای لێهاتووەو بێ ماڵو حاڵ کەوتووە، دواتر ڕوویکردووەتەوە وانەوتنەوە کە لەو بوارەدا ئەستێرەی درەوشاوە بووەو تا ئەمڕۆش دەدرەوشێتەوە.

ڕۆبێرت لە کتێبەکەیدا (Rich Dad Poor Dad) سەرنجمان بۆ زۆرشت ڕادەکێشێت، لەوانە:

* نووسەر لە ڕێی مۆنۆلۆگێکەوە چیرۆکی منداڵیی خۆی دەگێڕێتەوە، کە دابەشە لە نێوان ئامۆژگارییەکانی باوکی کە مامۆستای زانکۆیەو بە نازناوی (باوکە هەژارەکەم) ئاماژەی پێدەدات، (ئەو نازناوەش بە هیچ شێوەیەك جنێو نییە)، لەگەڵ ئامۆژگارییەکانی هاوڕێکەی باوکی «مایك»، کە سەرمایەگوزارێکی خۆدروستکارەو لە کتێبەکەدا بە (باوکە دەوڵەمەندەکەم) ئاماژەی پێدەدات.

فێر دەبێت چۆن پارەی چنگ بکەوێتو چنگی بخات، لەگەڵ بەراوردکارییەکی بەردەوام لە نێوان بارودۆخی باوکی، ئەکادیمیستە زانکۆییەکە، لەگەڵ هاوڕێکەی باوکی، پیاوە عەمەلییە بازرگانییەکە، پاشان پرسیارێکی زۆر ڕاستو گرنگ دەکات: ئایا خوێندنگاکان خوێندکارەکانیان ئامادە دەکەن بۆ چوونە ناو جیهانی واقیعییەوەو سەرکەوتن لەو جیهانەدا؟ ئایا لەبەرکردنی وانەکانو خۆماندووکردنو بڕوانامەو وەزیفەی بەرز ڕێگان؟

ئەوەی نووسەر لە پوختەی ئەزموونەکانی خۆی لە ژیاندا پێی گەیشتووە شەش وانەیە، بەم جۆرەش ئەو وانانەمان بۆ باس دەکات:

١- دەوڵەمەندەکان لە پێناوی پارەدا کار ناکەن.

٢- ئەگەر دەتەوێت دەوڵەمەند بیت هەندێك لە یاساو ڕێسا داراییەکان فێر ببە.

٣- گرنگی بە کارەکانت بدە.

٤- مێژووی باجگریو هێزی دامەزراوەکان.

٥- دەوڵەمەندەکان داهێنەری پارەن.

٦- کار بکەو بچۆرە وەزیفەوە بۆ ئەوەی فێری شت بیت، لە پێناوی پارەدا کارمەکە.

* ڕۆبێرت هەست بە پەژارە دەکات کە دەبینێت هەموو ئەوانەی بلیمەتو دەرکەوتوون لە ژیاندا دەناڵێنن، چونکە نازانن، یان نایانەوێت فێری پرەنسیپەکانی ڕۆشنبیریی دارایی بن، لە ژمێریارییەوە هەتا وەبەرهێنانو فرۆشو یاسا.

* کاتێك ڕۆبێرت یەکەمین کتێبی خۆی نووسییەوە، ناونیشانەکەی وەها دانا: ئەگەر دەتەوێت دەوڵەمەندو بەختەوەربیت، مەخوێنە، خاوەنی خانەی بڵاوکردنەوەکە ویستی ناوی کتێبەکەی بگۆڕێت بۆ ناونیشانێکی کلاسیکی، وەك ئابووریی فێرکاری، بەڵام خۆشبەختانە ڕۆبێرت سووربوو لەسەر ناونیشانەکەی خۆی، ئەوەش وەهایکرد کتێبەکەی پڕفرۆش بێت، خەڵکیش ماوەیەك ڕەخنەیان لێگرت بە هۆی ناونیشانە سەیرەکەیەوە، بەڵام کتێبەکە بەردەوام هەر دەفرۆشرا.

* قسەیەك هەیە دەڵێت وشەی وەزیفە Job لە زمانی ئینگلیزیدا کورتکراوەی ڕستەی (Just Over Broke)ە، کە بە مانای (بە حاڵ لە ژوور ئیفلاسییەوە) دێت، ئەوەش کە گرفتەکە قووڵتر دەکاتەوە ئەوەیە کە هەموان وەها دەزانن وەزیفە گرەنتییە، بۆیە دەبینیت تەنانەت ئامۆژگاریی کەسانی دیکەش دەکەن تا زیاترینی کات لەسەر یەك وەزیفە

بمێننەوە، وەك هێمایەك بۆ ئەوەی كە گوایا تۆ ئیدی فەرمانبەرێكی خاوەن ئەزموونیت، لە ڕاستیدا تۆ لەو حاڵەتەدا كۆیلەیەكی گوێڕایەڵیت.

* جاران مانەوە لەسەر یەك وەزیفە شتێكی باش بوو، بەڵام ئەمڕۆ ئەمسەرو ئەوسەر كردن لە چەند وەزیفەیەكی جیاجیادا كارێكی باشترە، چونكە ئەزموونی بەدەستهاتوو یارمەتیدەر دەبێت بۆ بڕیاری دروستو شیاو لە حاڵەتە ئاڵۆزەكاندا، ئەو حاڵەتانەی وەها پێویست دەكەن وێنەكە بە گشتیو لە هەموو لایەكەوەو بە شێوەیەكی سەراپایی ببینیت. ڕۆبێرت ئامۆژگاریی ئەوەمان دەكات لە نێوان كۆمەڵێك وەزیفەدا ئەمسەرو ئەوسەر بكەین، چونكە كاتێك كۆمپانیاكەی خۆت دادەمەزرێنیت ئەو ئەمسەرو ئەوسەرە بە كەڵكت دێت، چونكە شارەزای هەموو ئەو لایەنانە دەبیت كە كۆمپانیاكەت سەردەخەن.

* پێویستە كەمێك شت لە بارەی هەموو شتەكانەوە بزانیت، هەروەك پێویستە هونەری فرۆشو بازاڕ بە باشی فێربیت، ئەگەر نا، ئەوە مەپرسە بۆچی داهاتو دەرامەتت نزمە؟ بۆچی لە ژیانتدا سەركەوتنت دواكەوتووە؟

* زاڵبوون بەسەر كۆسپەكانی بەردەم سەركەوتندا... ڕەنگە ئازایەتیت تێدابێت، هەروەها پرەنسیپەكانی زانیاریی دارایی فێربیت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە سەركەوتن دوابكەویت، هۆكاری ئەو دواكەوتنەش پێنج هۆكارن كە خەڵكانێك لە دەستپێكردنی ڕەوتی خۆیان لەسەر ڕێگای سەركەوتن دوادەخەن، ئەو هۆكارانەش ئەمانەن:

١ — ترس.
٢ — ڕەشبینی.
٣ — تەممەڵی.
٤ — خووی خراپ.
٥ — لە خۆباییبوون.

* چۆن دەستدەكەیت بە وەبەرهێنان؟

خۆزگە ئەوە پرسیارێكی ئاسان بوایە، بەڵام زۆریش پرسیارێكی سەخت نییە، ئەوەندە هەیە كە وەڵامەكەی لای تۆیە خوێنەری بەڕێز، چونكە وەك چۆن هەرگیز ناتوانیت پۆشاكێك بدووریت بە كەڵكی هەموو مرۆڤەكانی سەر زەوی بێت، بە هەمان شێوە چارەسەرو وەڵامێكیش بۆ ئەو پرسیارە نادۆزیتەوە لە هەموو شوێنێكداو بەسەر هەموو كەسێكدا پیادە بكرێت.

وەڵامەكە ئەوەیە كە پێویستە دێوە نوستووەكەی ناو مێشكت بە ئاگابهێنیتەوە. بلیمەتە داراییەكەی ناخی خۆت بە ئاگا بهێنەرەوە، واز لەو بڕوایە بهێنە كە پارە سەرچاوەی هەموو خراپەكارییەكانە. پارە بنەڕەتو سەرچاوەی هەموو گوناهو خراپەكارییەكان نییە، بەڵكو دەستەكە بەسەر پارەدا زاڵەو ئاقاری پێدەبەخشێت. سەركەوتنت لە بواری داراییدا مانای ئەوە نییە ئیدی تۆ بەشێوەیەكی ئۆتۆماتیكی بوویت بە ئەهلی دۆزەخ.

ئێمە هەموومان فێری ئەوە بووین چۆن لە شتێكدا لێهاتوو بین بۆئەوەی لە پێناوی بەدەستهێنانی پارەدا كاربكەین، بەڵام فێر نەبووین چۆن وەها بكەین پارە كارمان بۆ بكات.

بۆئەوەی هەریەكە لە ئێمە بتوانێت دێوە نوستووەكەی ناخی خۆی بە ئاگابهێنێت، (١٠) هەنگاوتان فێردەكەم:

١ — من پێویستم بە هۆكار، یان پاڵنەرێكی بەهێزتر هەیە، لە واقیع (هێزی ڕۆح).
٢ — من ئازادم لە هەڵبژاردندا (هێزی هەڵبژاردن).
٣ — هاوڕێكانت بەوپەڕی پەرۆشییەوە هەڵبژێرە (هێزی پێكەوە بەسترانەوە).
٤ — لە فێربووندا خێرابە، فێری شتێكی جێددی بەو بە تەواوی بیزانە ئینجا دەست بۆ شتێكی تر ببە.
٥ — مافی خۆت بدە لە پێشدا (هێزی دیسپلینكردنی خود).
٦ — لە خەمی ئەوەدا بە ئامۆژگاریو ڕاوێژی باشت دەستبكەوێت.
٧ — وەك هیندییە سوورەكان بەخشندەبە.
٨ — داهاتی بنەچەكان، تەواوكارییەكانت بۆ دەكڕن.
٩ — پێویستی بە پاڵەوان.
١٠ — خەڵكانی دیكە فێربكە پاداشت وەردەگریت.

سەرچاوە:

http://www.ama_1 zon.com/exec/obidos/ ISBN=0446677450/quasyl_ _#/atic
yomgedid.kenana_2 online.com/topics/57330/ _downloads/1531
The Real Financial Inde_ pendence
Posted by Mel | Posted in Financial Independence | Posted on 01_07_2009
Tags: Financial intelli_ gence, Never Work Again Seminar, Rich Dad Poor Dad

## پاییز

وەردە حەمە عەزیز

كە پاییز دێت، بۆنی میهرەبانی لەگەڵ خۆشەویستیدا دێت.. بۆنی دۆستایەتیی پاكو منداڵانە.. بۆنی پەرتوكو پەڕاوە نوێیەكانی.. بۆنی جانتای پڕ لە موحیببەت.. بۆنی ئەو پێكەنینانەی كە لە دڵەوە هەڵدەقوڵێن.. بۆنی شادی منداڵەكان. دەنگی زەنگی قوتابخانەو ئاوێزان لەگەڵ خشەخشی گەڵا زەردەكانی پاییز.. بیرهێنەرەوەی شیرینترین یادگارییەكانی ئێمەیە.

# توێژینەوەی زانستی بەرپرسیارێتییە

م. هۆزان جەلیل حەمە سەلیم

ئاشکرایە جیهانی پێشکەوتوو سات بە سات ڕووبەڕووی گۆڕانکاری دەبێتەوە لە بوارە جیاوازەکاندا، گۆڕانکارییەك لەسەر ئەو بنەمایەی کە مرۆڤایەتی بەرەو خۆشبەختی، یان مەخابن بەرەو نەهامەتیو بەدبەختی بەرن، زۆرینەی کات ئەو گۆڕانکارییە پەیوەستە بەو توێژینەوانەی لە ناوەندە ئەکادیمییە جیاوازەکاندا بە ئەنجام دەگات.

دەزانن کێ بەم ئەرکە هەڵدەستێت؟ بێگومان چینی توێژەرانو پسپۆرانن کە دەبنە خاوەنی ئەم کارە، چەند خۆشبەختییە توێژینەوەیەك ئەنجام بدەن کە مرۆڤایەتی شادمان بکاتو بزە ببەخشێت بە لێوەکان، لە لاپەڕەکانی مێژوودا ڕووسوری بۆ خۆیو نیشتیمانەکەی تۆمار بکات، بەردەوام ناویان بە زیندووی لە هەموو کوچەو کۆڵانێکی ئەم زەمینەدا بە ئێمەو نەوەکانی دواتر بناسرێت، گرنگە نەڕوانرێت بۆ ژیان لە بیرکردنەوەی کەسانێکەوە کە بە تاوانی دەزانن ژیان بە هێمنیو ئارامی لەم گێتییەدا بگوزەرێت، یان بە ئەنجامی توێژینەوەکانیان مرۆڤایەتی بەرەو کارەسات ڕەوانە بکەن، زۆر گرنگە بزانین بەر ڕقو توڕەیی مرۆڤایەتی دەکەون، لە مێژوودا تا ئەبەد دەبنە خاوەنی تۆمارێکی قێزەون، توێژینەوەکان هەندێجار لە ناوەندە ئەکادیمییەمکانیانەوە پێشکەشی مرۆڤایەتی کراون لێرەدا پریڤەی ئەمیل دورکایم دێتەوە یاد، (کە ئەو ناوەندانە بە کۆمەڵگەیەك ناوزەند دەکات بۆ تەواوکردنی خوێندن، ناوەندەکە گرنگترین هۆکاری ڕێکخستنو هەستی بەرپرسیارییەتی ئەندامانی سیستەمەکەیە) کەواتە یەکێك لەو وانەیەی لەم وتەیەوە هەڵی دەهێنجێنین هەستی بەرپرسیاتییە!

زۆر پێویستە نەوەکانی داهاتوو بەشێوەیەك پەروەردە بکرێن کە هەستی بەرپرسییەتییان تیا بەرجەستە بکرێت، بۆئەوەی کە لە داهاتوودا نازناوی توێژەری پێبەخشرا ئەو هەستکردنە بە بەرپرسیارێتییە دەروازەیەك بێت ئەنجامی توێژینەوەکان، مرۆڤەکانو ڕووەكو ژینگەو گیانداران بەرەو ئارامی ببەن.

یەکێك لە ئامانجی توێژەران هەوڵدانی زانستیو گەیشتنە بە ڕاستییە نوێیەکان، دۆزینەوەی شت گەلێك تا ئەم ساتە پەی پێ نەبراوە، دڵنیابوون لە ڕاستییەکانو لێکدانەوەو چارەسەرکردنی گرفتەکان، ئەو هەوڵدانەش بەبێ مەبەستو ئامانج نییە، چەند گرنگە ساتێك تەرخان بکەین لە ناخماندا گفتوگۆیەك ئەنجام بدەین تا وێنەیەك بکێشین سەرتاپا خزمەت بێت بە مرۆڤایەتی، کاتێك ئەو وێنەیە نمایش دەکەین مرۆڤایەتی بە هیچ شتێك بۆیان نەنرخێت.

تیشکم خستە سەرئەوەی توێژینەوە چەند لایەنەیە بە بۆچوونی من یەکێك لەو لایەنانە خزمەت کردنە بەخود، ئەمەش توێژەر مافی خۆیەتی، لایەنێکی تری توێژینەوە گرنگە وێڵ بوون بێت بە دوای درك پێنەکراوەکان، گومانەکان، یان کێشەو گرفتەکان کە مرۆڤایەتی پێوەیان دەناڵێنن، سات بە سات لە چاوەڕوانی چارەسەردان، دەزانن چەند خۆشبەختییە کە مرۆڤایەتی لە چاوەڕوانی ڕزگار بکەین؟!

ئەنجامی توێژینەوەکانە ئابووری وڵاتان لە دارمان دەپارێزن، کێشە کۆمەڵایەتییەکان چارەسەردەکەن، ئەو کەلێنانە پڕدەکرێتەوە کە پەی پێ نەبراوە، ژینگەکەمان دەپارێزن، کاتێك توێژینەوە زانستییەکان بە میتۆدێکی زانستی دروست بە ئەنجام بگەیەنرێت دەتوانین لە واقیعدا هەست بە ئەنجامەکان بکرێت، لە ڕەنگدانەوە دروستەکەی دڵنیا بین.

زۆر گرنگە توێژەر وێنە بۆ توێژینەوەیەك بکێشێت کە یەکەمین بێت لە لایەنی پێداویستی مرۆڤایەتییەوە، توێژەر زۆر گرنگە کاریگەری بیرو بۆچوونو ئایدیایەکی تری لەسەر نەبێت تا لە کاتی ئەنجامدانی توێژینەوەکاندا ئەنجامەکان وەك خۆی بگەیەنرێت، ئەوەی مەبەستمە ئاماژەدانە بە توێژینەوە زانستییەکان، چونکە مرۆڤایەتی زۆرینەی کات کار لەسەر ئەنجامی توێژینەوەکان دەکات، وەکو لەئەنجامی کاری توێژەرانەوە کارکرا بۆ دەستکاریکردنی بۆ ماوەیی لە ڕووەکە بەردارەکان، تا بەرەکانیان بە ڕێژەیەکی بەرچاو زیاد بکرێت، لەگەڵ زیاد بوونی دانیشتواندا پێداویستی خەڵك فەراهەم بکرێت، دۆزینەوەی هەندێ مادده بۆ چارەسەری هەندێ نەخۆشی کە مرۆڤەکان بەردەوام چاوەڕێی چارەسەرن بۆ نەمانی ئازارەکانیان تا جەستەیەکی تەندروستی ئارامیان هەبێت، بەردەوام بن لە ژیانی ئاساییان، ئەدیسۆن بوو بە

ئەنجامی توێژینەوەکانی شەوە تاریکەکانی بۆ کردین بە چراخان، زۆر توێژینەوەی دروستی تر، گرنگە بزانین ئەمانە کاری کەسانێکە وێڵن بە دوای کێشەو پێداویستی مرۆڤایەتییەوە، خاوەنی هەستی بەرپرسیارێتین، ئامانجیان دروستەو خۆیان بە خاوەنی کێشەکانی مرۆڤایەتی دەزانن، شەو و ڕۆژ دەکەن بە یەکو شادمانن کاتێك مرۆڤایەتی خۆشبەخت دەبێت، ناویان هەمیشە بە زیندووی دەمێنێتەوە!

پێویستە پەی ببەین کە کەسانێك لەم جیهانەدا توێژینەوەی زانستیان بە ئەنجام گەیاندووە سەرەڕای تەرخانکردنی کاتێکی زۆرو ماندووبوونێکی بەردەوامو تێچوونێکی گەورە لە بودجەدا، تۆ لەم ساتەدا ڕەنگە وا چاوەڕوان بیت کە مرۆڤایەتی خۆشبەخت کردبێت، من دەڵێم بە داخەوە مرۆڤایەتی ڕووەکو دەریاو کانیو گیاندارانی بەرەو لە ناوچوونو کارەسات بردووە، کە هەریەکێك لەوانە بە ئازادی دروستبوونو دەبێت بە ئازادی بژین، بەڵام کەسانێك کە نە هەڵگری ناوو توێژەرن نە خاوەنی بەرپرسیارێتین ئازادی ئەوانی لە گۆڕناوە دەتوانیت بیر لە ڕابردوو بکەیتەوە کە هەر ئەو ماددە کیمیاویانە بوو کە لە تاقیگەکاندا بەرهەم هات، بووە خۆی لە ناوچوونی ژمارەیەکی بەرچاو لە مرۆڤی بێتاوانو دارودرەختو گیانداران، ڕەنگو شێوەو جوانیی دەریاو کانییەکانیان بە مەبەستە قێزەونەکانیان بەرەو کارەساتێك برد کە ڕەنگو شێوەو جوانی خۆیان لە یاد بکەن!

ئەگەر ئاوڕێك لە مێژوو بدەینەوە دەتوانین لە وێنەکانی هەڵەبجەو هیرۆشیماو ناکازاکی بڕوانین. لە هزرتاندا بە دوو جۆر کەسایەتی ئاشنا بوون، کەسایەتییەك لە پێناوی بەرژەوەندی تایبەتدا مرۆڤایەتی فەرامۆش بکاتو بەرەو هەڵدێریان بەرێت، هێنانە کایەی ژینگەیەکی شێواو! کەسایەتییەکەی تریان هەڵگری بەرپرسیاریەتی دروست بەردەوام بۆ نەهێشتنی ئاریشەکانی ئەم گێتییە، ئاسوودەیە بە ئاسوودەیی مرۆڤایەتیو بەختەوەرە بە بەختەوەری گیانداران، ئارامە بە ئارامی ئەم ژینگەیەی هەمووو بوونەوەر ژیانی تیا دەگوزەرێنن، تا لە کۆتادا پێنووسەکان ئەو وشانە بنەخشێنن لەسەر پەڕاوەکانی مێژوو سەراپا شانازی بکرێت بەو کۆمەڵگەیەی کەسایەتییەکی وای بەخشییووە بە مرۆڤایەتی، هیوادارم هەر یەك لە ئێمە هەڵگری ئەو کەسایەتییە بین، خانەوادەو دۆستانو نیشتمانو جیهان شانازیمان پێوە بکەن.

# کێ دەتوانێت مریشکەکە لە شووشەکە دەربهێنێت؟

**و: پێگەرد فارس**

سەرپەرشتیاری وانەی فیزیا سەردانی خوێندنگەیەکی کرد تا لە نزیکەوە ئاگاداری وتنەوەی وانەی فیزیا بێت لە لایەن مامۆستای فیزیاوە، مامۆستاکەش دەستی کرد بە وتنەوەی وانەکەی، لە کاتی وتنەوەی وانەکەدا یەکێك لە قوتابییەکان وانەکەی پێ بڕیو وتی: مامۆستا فیزیا وانەیەکی زۆر گرانە، هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبوو ئەوانی تریش دەستیان کرد بە ناڕەزایی دەربڕینو هەمان ڕای هاوڕێکەیان هەبوو، هەر یەکە لە لایەك قسەی دەکرد، یەکێك هاواری دەکردو یەکێکی تر هەوڵی دەدا کاتی وانەکە بە فیڕۆ بدات...

مامۆستاکە کەمێك بێ دەنگ بوو پاشان وتی: باشە ئەمڕۆ هیچ وانەیەك ناخوێنین، وانەکە دەگۆڕین بۆ یاری!! قوتابییەکان زۆریان پێخۆش بوو.

سەرپەرشتیارەکە زۆر لای سەیر بوو، مامۆستاکە لەسەر بۆردەکە وێنەی مریشکێکی کێشا لە ناو دەفرێکی شوشەدا کە دەمی دەفرەکە زۆر باریك بوو... پاشان وتی: کێ ئەو مریشکە لەو شوشەیە دێنێتە دەرەوە بێ ئەوەی شوشەکە بشکێتو مریشکەکەش نابێت مردار بێتەوە؟

قوتابییەکان زۆر هەوڵیان دا بۆ وەڵامدانەوە، بەڵام هەموو شکستیان هێنا، قوتابییەك بە بێ هیواییەکەوە وتی: مامۆستا ئەو مریشکە نایەتە دەرەوە هەتا شوشەکە نەشکێنیت، یان مریشکەکە مرداربێتەوە.. مامۆستاکە وتی: نابێت مەرجەکان پشتگوێ بخرێن، قوتابییەك وتی: کەواتە مامۆستا بەو کەسە بڵێ کە مریشکەکەی خستووەتە ناو شوشەکە هەرخۆی بیهێنێتە دەرەوە، هەموو دەستیان کرد بە پێکەنین، بەڵام پێکەنینەکەیان درێژەی نەخایاند، مامۆستاکە پێی بڕین بە وتنی: ڕاستە... ڕاستە ئەوە وەڵامەکەیە!!

هەرکەسێك مریشکەکەی خستە ناو شوشەکە هەرئەویش دەتوانێت بیهێنێتە دەرەوە... ئێوەش بە هەمان شێوە:

مەفهومی گرانی مادەکەتان خستووەتە مێشکتانەوە، منیش هەر شتێك بڵێمو شی بکەمەوەو ئاسانی بکەم سەرکەوتوو نابم، هەتا ئێوە ئەو بۆچوونە لە مێشکتان دەرنەکەن بە بێ یارمەتی، هەروەك چۆن بێ یارمەتی خستوتانەتە مێشکتانەوە.

مامۆستاکە دەڵێت: وانەکە تەواو بوو... سەرپەرشتیارەکە زۆر سەرسام بوو ئەو هەڵوێستەی زۆر پێ جوان بوو... قوتابییەکانیش دوای ئەوە زۆر بە ئاسانی لە وانەکە تێ دەگەیشتن!

قوتابییەکان یەك مریشك دەکەنە شوشەکەوە، ئێمە چەند مریشکمان خستووەتە ناوییەوە؟

کەواتە هیچ شتێك نییە لەم دونیایەدا گران بێت، ئەگەر سەرەتا پشت بەخوای گەورە ببەستیت، ئەوەش بخەیتە مێشکتەوە کە هیچ شتێك گران نییە مەگەر بە ویستی خۆت گرانی بکەیت... هەر بە ویستی خۆت دەتوانیت ئاسانی بکەیتو بێ هیچ کێشەو ڕێگرێك بە جێی دەهێنیت.

هەموومان دەتوانین مریشکەکە لە شوشەکە دەربهێنین، پاش پشت بەستن بەخوای گەورەو هەوڵو بیرکردنەوەی خۆمان...

هەر بۆیە پێویستە قەبارەیەکی گەورە نەدەینە کێشەکانو گەورەیان نەکەین..

دەست پێکردنو بەرەو پێش چوونو ئارام گرتن باشترە... نەك ناڕەزاییو بێزاری دەربڕین.

سەرچاوە: مدونە ارتقا ورقی

م. محەممەد مەلا مەحموود

# (بەخت) لە نێوان ڕاستیو خەیاڵدا

ئێمەی مرۆڤ زۆرجار گلەیی لە بەختو بەشی خۆمان دەکەین، بێ بیرکردنەوەو تێڕامان هۆکاری شکستو سەرنەکەوتنمان دەگێڕینەوە بۆ بەخت، بەردەوامو ڕۆژانە کەسانێك دەبینین ئەم دەستەواژەیەیان لەسەر زارەو کردویانە بە دروشمی ژیانیان، هەموو سەرنەکەوتنو شکستێکیان دەدەنە پاڵ ئۆباڵی بەخت. بەڵام ئێمە وەك مرۆڤێکی خاوەن هەستو ژیریی، پێویستە هەڵوەستەیەك لەسەر ئەم بۆچوونەو هاوشێوەکانیان بکەین، لە ژێر چەتری ئایینو زانستدا خوێندنەوەیان بۆ بکەین، تاوەکو لە حەقیقەت لانەدەین، چیتر دەستەوەستان نەبین لە ئاست هەوڵو کۆششەکانماندا، بەردەوامبین لە گەڕان بە دوای هەلی باشترو هەوڵی زیاتر.

سەرەتا هەروەك زانای دەروونناس (دیل کارنگی) پێناسەی بەخت دەکاتو دەڵێت: بریتییە لە ئیمتیازاتەکانی ژیان، سەرکەوتن لە ئیشو کار، بەرزبوونەوە لە پۆستدا، کۆکردنەوەی پارەیەکی زۆر... کە دەستی کەسێك دەکەوێت بە بێ ئەوەی شیاوی بێت، یان لە ئاستی ئەو پێگەیەدا بێت کە پێی گەیشتووە، ئیتر لە زانستەکەیدا بێت، یان لە توانای کارگێڕی، یان زیرەکی، یان توانای لە پڕ کردنەوەی ئەو پۆستانەی پێی گەیشتووەو بەرقەراریی وەرگرتووە.

بێگومان ئەم جۆرە بیروبۆچوونانە لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا جێگەی نابێتەوە، چونکە ئیسلام بەرنامەیەکی تێروتەواوە بۆ سەرجەم مرۆڤەکان، جیاوازی نێوان هیچ کەسو ڕەگەزو هیچ چینو توێژێکی تێدا نییە، بەڵکو خوای گەورە هەموو بوونەوەرو زەوی بۆ خزمەتی مرۆڤەکان دروستکردووە، بڕیاری داوە هەموویان بۆ بە دەستهێنانی خولیاو خۆزگەکانیان هەوڵ بدەن، وای بڕیار نەداوە بە بێ هەوڵو هیممەت هیچ کەس بگات بە ئەو ئامانجەی لە ناخیدا دەخولێتەوەو خەونی پێوە دەبینێت، چونکە هەروەك خۆی دەفەرموێت: (وأن ليس للإنسان إلا ما سعى وأن سعيه سوف يرى) النجم/ ٣٩ - ٤٠. هەموو کەسێك بە پێی هەوڵو ماندووبوون دەگات بە ئامانج، مرۆڤ لە هەوڵو کۆششی خۆی زیاتر هیچی دەست ناکەوێت، ژیانیش گوزارشتە لە چەندین هەل، ئەوەی ئامادەیی تێدا بێت دەیقۆزێتەوە، ئەوەشی ئامادەیی تێدا نەبێت لەسەری دەخەوێت، ئائەمەیە بەخت.

بەخت وشەیەکی بێ مانایە، لەم دنیایەدا شتێك نییە بە ناوی بەختەوە، هەمیشە کۆششی بەردەوام یاریدەدەرێکی باش بووە بۆ گەیشتن بە ئامانجو ئەو مەرامانەی کەسی تێکۆشەر هەیەتیو بە دەوریدا دەخولێتەوەو بەدوایدا دەگەڕێت، خوای گەورە بەش و بەختی باشی بە هەندێك لە بەندەکانی نەبەخشیوەو ئەوانی تری فەرامۆش کردبێت، پەروەردگار زوڵمو ستەم لە هیچ بەندەیەکی خۆی ناکات. چەندین جار ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە سەرەنجامو چاکیو خراپی کارو کردەوەکان لە ئەستۆی مرۆڤەکان خۆیاندایە، هەروەك دەفەرموێت: «هەموو کەسێك لە بارمتەی کردەوەکانی خۆیدایە»، ئەنجامی هەموو کارەکان وابەستەی کاری خودی مرۆڤەکان خۆیانە، هەروەك پێشنانیشمان وتویانە: (چی بچێنیت، هەر ئەوە دەدووریتەوە).

دەبێت ئەوەشمان لا ڕوون بێت کە کەسانی بیرو باوەڕساغ لەم دنیایەدا توشی چەندین نارەحەتیو نەهامەتی دەبنەوە، هەر وەك پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت) پێشەنگ بوون لە ڕووبەڕووبوونەوەو ئەشکەنجەو ئازاردانا، لەگەڵ ئەمەشدا خۆشەویستو هەڵبژێردراوی خودا بوون، ڕۆژێك لە ڕۆژان وشەی (بەخت)یان بە زاردا نەهاتووەو بێزارییان دەرنەبڕیوە، چونکە دڵنیابوون، لەوەی کە ئەمە تاقیکردنەوەی خوای گەورەیە، خودایش گرانیو ئاسانی تاقیکردنەوەکان بە گوێرەی بەهێزیوبە پێزی بیروباوەڕی کەسەکە ئەنجام دەدات، کەواتە ئێمەی مرۆڤ دەبێ ئامادەییمان تێدا بێت بۆ هەموو جۆرە تاقیکردنەوەیەك، مردن، نەخۆشی، ناخۆشی، گرانی، زیانی دارایی، شکستهێنان، گیروگرفت... کەواتە لەڕووی ئایینیەوە بۆمان ڕوون بووەوە کە وشەی (بەخت) هیچ بنەمایەکی نییە، بەڵکو تەنها ئەفسانەیەکەو خودی مرۆڤ خۆی هێناویەتیە بەر باسو خواس.

لە ڕووی زانستیشەوە زانای مەزن (دیل کارنگی) دەڵێت: من بڕوام بە بەخت نییە بەوەی مەسەلەیەکە چارەنوسی مرۆڤ دیاری دەکاتو بەرەو پێشی دەبات، یان یارمەتیدەری بێت لە پلەو پایە گەورەو پۆستە باڵاکاندا.

بێگومان ئێمە سیفەتی بەخت نادەینە پاڵ زانایەکی سەرکەوتوو، یان کەسێکی زیرەكو لێهاتوو، یان کارگێڕێکی کارامە، چونکە خاوەنی ئەم خەسڵەتانە شیاوی ئەوەن کە ئەم پۆستانە بگرنە دەست، بە تایبەت ئەگەر ئەو کەسە ڕەوشت بەرزو ڕاستگۆو دامەزراو بێت. کەواتە خەڵکانێك بەختیان هەیە کە لە ژیاندا بەشێکیان پێدراوەو شیاوی نین، بە بێ ئەوەی لە ئاستیدا بێت دەگاتە پۆستە باڵاکان سەرمایەیەکی گەورە کۆ دەکاتەوە، نەك لە ڕێگەی زانستو زانیاری دەربارەی ئابووریو کاروباری دارایی، بەڵکو بە هۆی بارودۆخێکی لە بارەوە، یان لە میانەی هاوڕێیەتیگەلێکی بایەخدارەوە کە لەمیانەی خزمەتکردن، یان پەرستنەوە پەیوەندی پێوە کردووە، ئەویش دەوڵەمەندی کردووەو جیای کردووەتەوە. بۆیە دەبینین ئەم جۆرە کەسانە هەر لەم دونیایەدا مردوونو چاوەڕێی کەسانێك دەکەن بە خاکیان بسپێرن. (چۆن سەرکەوتوو دەبیت؟ دیل کارنگی). کەواتە با هەموومان پێکەوە لە هەوڵی بێ وچاندا بین بۆ ئەوەی ڕەوتی ژیان بەرەو پێش بەرینو داهاتوویەکی گەش بۆ خۆمانو کۆمەڵگاکەمان بنیات بنێین.

راهێنانی

# مێشك

به وردی لەم وێنەیە ورد بەرەوەو
هێزی مێشكو بیركردنەوەت بخەرەكار
بزانە چی دەبینیت؟ تا چ رادەیەك دیدی تێڕوانینت وردە؟

پەری شێخ کەریم

# جیاوازی تەمەن لە نێوان هاوسەراندا

ئایا جیاوازی تەمەن کاریگەری هەیە بۆ پەیوەندییە خێزانییەکان؟

ئایا جیاوازی گونجاو دەبێت چەند دەبێت؟

ئایا دەبێت پیاو لە ئافرەت گەورەتر بێت، یان بە پێچەوانەوە؟

ئەمانەو چەندەها پرسیاری تر کە ڕووبەڕووی خێزان دەبێتەوە، وەك دەزانین لە ڕابردوودا ئەم شێوازی بیرکردنەوەیە نەبوو، واتە بایەخ نەدراوە بە تەمەنی کچو کوڕ، لەبەرئەوە زۆر جار ڕووی داوە ئافرەتێك هاوسەرگیری کردووە لەگەڵ کەسێکدا کە چەندەها ساڵ لە خۆی گەورەتر بووە، یا بە پێچەوانەوە ئافرەتەکە چەندەها ساڵ لە هاوسەرەکەی گەورەتر بووە، لەوانەیە هەندێجار ژیانیان لەو خێزانانە ئاسوودە تر بووبێت کە هاوتەمەنن، یان چەند ساڵێکی کەمییان لە نێواندایە، بەڵام ئەمڕۆ ئەم جۆرە خوازبێنیە شتێکی نامۆیە، ڕاو بۆچوونی خەڵکی وایکردووە کە ئەم شێوازی خوازبێنیە جگە لە ناکۆکی هیچ سوودێك ناگەیەنێت بە خێزان، زۆرجار بوونی ئەم هۆکارە کێشە دروست ناکات بەڵام تێنەگەیشتنو بیرکردنەوەیەکی هەڵە وادەکات ببێتەکێشەیەکی سەرەکی بۆ هەردوولا، هەمیشە وابیردەکەنەوە کەمتەرخەمییەکیان هەیە لە ژیانداو لە خۆشییەکانی ژیاندا ئەمان بێ بەشن، بەڵام بە پێچەوانەوە گرنگ لە ژیانی هاوسەرێتیدا ڕێکەوتنی هەردوولایە لەسەر بیروبۆچوونێك کەپێکەوە ژیانیان ئاسوودە بێت هەمیشە لە سەر بنەمای ڕێزو خۆشەویستی بژین.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئەوە ڕوون بکەمەوە پێکهێنانی خێزان سەرەتا لە هاوسەرەوە دەست پێ دەکات، پیاو دەچێتەخوازبێنی ئافرەت بە هەموو هەلوومەرجێك ڕازییەو ئاگادارە لە هەموو شتێك، بێگومان کاتێك ڕازی بووە بە هەر کەمتەرخەمییەك بۆ پێوستییەکی تایبەتی خۆی بووە، یا خۆشەویستییەکی سۆزدارانە بووە، یا حەزیکردووە ئافرەتەکە لە خۆی گەورەتربێت، یاخود چەند ساڵێکی کەم لە نێوانیاندا بێت، بەڵام پاش ماوەیەك یا چەند ساڵێك هەمووخۆشەویستیو پەیمانەکانی لە بیردەچێتەوە، ژیانی خۆی لەگەڵ کەسانی تردا بەراورد دەکات، سەیری ڕاوبۆچوونی خۆی ناکات لەگەڵ خێزانەکەیدا، بەڵکو دەڕوانێتە بۆچوونو عاداتی کۆمەڵگا وادەزانێت بێ بەشە لە بەدەستهێنانی خۆشییەکانی ژیاندا، واگومان دەبات کە ئەم جیاوازی لەگەڵ خێزانەکانی تردا هەیە. هەر وەك وتراوە ژیان مرۆڤ ناگۆڕێت، بەڵام مرۆڤ ژیان دەگۆڕێت، لەبەرئەوە زۆرجار مرۆڤ بەجۆرێك بیردەکاتەوە کە هەموو دەرگاکانی لەسەر داخرابێت، بەڵام خۆی دەرگای لەخۆی داخستووە، هەمیشە دەڕوانێتە سەختییەکانی ژیان نەك خۆشییەکانی، بێگومان ئەو کەسەش ئاسوودە نابێتو ناتوانێت لە هیچ بوارێکدا سەرکەوتوو بێت.

بابەتی دووەم کە لە سەوەرە پرسیارمان لێکرد، ئەوەیە ئایا جیاوازی گونجاو دەبێت چەند بێت؟

هەرچەندە ڕابۆچوونو چیرۆکی ژیانی ئەو کەسانەم خوێندووەتەوە کە دەڵێن: جیاوازی هەردوولا پێنج تا دەساڵ بێت، واتە لە دەساڵ زیاتر نەبێت، بۆ زیاتر سەلماندنی ئەم بۆچوونە (دکتۆر عەبدولا محەممەد فەوزان) مامۆستایەکی شارەزایە لە بواری کۆمەڵایەتیدا لە زانکۆی مەلیك سعوودە، دەڵێت جیاوازی تەمەن لە نێوان هاوسەراندا هۆکارێکە بۆ تێگەیشتنو هاوسەنگی بیرو بۆچوون، هەمیشە واباشترە کە پیاو لە ئافرەت گەورەتر بێت، چونکە پیاو بەرپرسە لە بەڕێوەبردنی خێزان بە مەرجێك لە دەساڵ زیاتر نەبێت، بەڕاستی زۆرجار لێکۆڵینەوەمان کردووە لە بارەی ئەو خێزانەی کە هاوسەرەکەی پانزە ساڵ، یا بیست ساڵ لە خێزانەکەی گەورەترە دەرکەوتووە ئارەزوو و خۆشیو ڕاووبۆچوونەکانیان جیاوازن، بۆ نموونە ئافرەتێك باسی ژیانی خۆی دەکات دەڵێت: (جیاوازی تەمەنی منو هاوسەرەکەم حەڤدە ساڵە، ئێستا من تەمەنم (٤٠) ساڵە، ئەویش تەمەنی (٥٧)ساڵە، هەرچەندە پیاوێکی زۆر دڵپاکەو بە هەستە، بەڵام ئەوەی کە هەمیشە پێشبینی دەکەم لە ژیانماندا، زۆر جار ئارەزووم هەیە بۆ کارێك، یا سەردانێك، یا سەیرانێك، ئەو حەزی لێنییەو زۆرێك لە ڕاووبۆچوونەکانمان بە هۆی جیاوازی تەمەنەوە جیاوازن)، دکتۆر عەبدولا دەڵێت: بۆ نموونە هەمیشە تەمەن بچوکەکە لە سەرەتای بەرنامە

ڕێژیدایە بۆ کاروبارەکان، بەڵام تەمەن گەورەکە لە کۆتایی بەرنامەڕێژیدایە، ڕەنگە هەندێجار حەز بکات وەك ئەو، یا لەبەر ئارەزووی خێزانەکەی هەڵسێت بە کارێك، بەڵام تەمەنەکەی قورسایی‌و بەربەستی بۆ دروست دەکات.

پرسیاری سێیەم ئەوەیە ئایا پیاو لە ئافرەت گەورەتر بێت، یا بە پێچەوانەوە؟

وەك لە سەرەتادا ئەوەمان ڕوون کردەوە زۆربەی دەروونناسان بۆچوونیان لە سەر ئەوەیە کەپیاو لە ئافرەت گەورەتر بێت باشترە، بەڵام ئەگەر لە حاڵێکیشدا ئافرەتەکە چەند ساڵێك لەپیاوەکە گەورەتربێت هیچ کێشە نییە، هەندێك پیاوانیش خۆیان وەها ئارەزوویەکیان هەیە بەو مەرجەی جیاوازییەکە زۆر بەرچاو نەبێت کە هەندێجار سێ تاچوار ساڵ دەبێت‌و جیاوازییەکی بەرچاو دروست دەکات، مەبەستی شارەزایانیش لەوەی کە پێیان باشە پیاو لە ئافرەت گەورەتر بێت، لەبەرئەوەیە کە بەڕێوەبردنی ماڵ‌و خێزان سەرەتا لە ئەستۆی پیاودایە پاشان ئافرەت، هەروەك زەینەب غەزالی دەڵێت: لەبەرئەوەی ئافرەت لایەنی گەشەی جەستەی زووترە لە پیاوان بە هۆی هۆکاری دووگیانی‌و منداڵ بوونەوە،بۆیە زووتر لە پیاو تووشی ماندوویەتی‌و تێکچوونی جەستەیی دەبێت، هەموو ئەو بوارانەی باسمان کرد بەشێوەیەکی زانستییانە دەرکەوتووە، هیوادارین هەموو خێزانەکان دووربن لە کێشەو ناخۆشی‌و هەمیشە ئاسوودە بژین، هەرخێزانێك جیاوازی تەمەنیان هەیە لە کەمتەرخەمی‌و ناکۆکیەکانی یەکتری ببورن، وەك لە سەرەتای باسەکەماندا ڕوونمان کردەوە زۆررێك لە خێزانەکان هاوتەمەنن، یا جیاوازی کەم لەنێوانیاندا هەیە، بەداخەوە بیروبۆچوونیان جیاوازە، ئەمەش پەیوەندی بە نەریتی خۆیانەوە هەیە، ئەگەر هەردوولا گوێڕایەڵبن بۆ فەرمان پێشنیارەکانی یەکتری ئەوە بەردەوام تا کۆتایی ژیانیان بە لێبوردەیی‌و وەفاداری بەسەر دەبەن.

لە کۆتاییدا هیوای سەرفرازی بۆ خێزانەکان دەخوازم، هیوادارم ئەو بوارانەی باسم کرد یارمەتیدەر بن بۆ لایەنی دەروونی یەکتری نەك پەشیمانی‌و سەر زەنشتکردنی یەکتری‌و کەمتەرخەمی لە ژیاندا.

# ژیان فێری کردم

**ژیان فێری کردم:** مرۆڤ هەروەکو چۆن جل‌وبەرگ‌و هاوڕێ‌و کتێب‌و شوێنی نیشتە جێبوونی هەڵدەبژێرێت، بە هەمان شێوە پێویستە بیروبۆچوونی ڕاست و گونجاو هەڵبژێرێت.

**ژیان فێری کردم:** کە فەرهەنگی سەرکەوتن، لە هەر دوو وشەی (ئەگەر)و (بەڵام) پێك نەهاتووە.

**ژیان فێری کردم:** ئەگەر پارێزگاریت لە ئارامی‌و شکۆمەندی خۆت کرد، با مشتومڕو گفتوگۆی نێوانتان زۆر توندوتیژیش بێت، ئەوا تۆ دەبیتە خاوەنی هەڵوێست‌و دەتوانیت دڵی بەرامبەر بۆ نێو ڕیزەکانی خۆت ڕابکێشیت، لە هەمان کاتدا دەتوانیت ڕای گشتیش بە دەست بهێنیت، لە کۆتاییشدا کێشەکە لە بەرژەوەندی تۆ تەواو دەبێت.

**ژیان فێری کردم:** ئەم دنیایە بە وێنەی ئاوێنەیە، تەنها ئەو وێنانەمان نیشان دەدات کە پێی دەدەین، کاتێك تۆ سکاڵا لە دەست دنیا دەکەیت، ڕووخسارێکی خەماویت پیشان دەدات، ئایا تۆ ڕووخسارێکی جوان‌و گەشت پیشان داوە؟!

**ژیان فێری کردم:** فێربووم ئەوەی کار نەکات هەڵەش ناکات.

**ژیان فێری کردم:** لوتکەی هەموو ژیانێکی سەرکەوتوو، ئارامگرتن‌و لەسەرخۆییە!

**ژیان فێری کردم:** ببە بە خاوەنی بارودۆخ، نەك کۆیلەی بارودۆخ، بۆئەوەی ببیتەخاوەنی بارودۆخ، سەرەتا پێویستە سەرکردایەتی دەروونی خۆت بگریتە ئەستۆ، چونکە مرۆڤ دەتوانێت هەموو ئاواتەکانی بهێنێتە دی، بە ئارامگرتنێکی ڕێکوپێك‌و بەردەوام.

**ژیان فێری کردم:** چارەنووست بە سروشتی خۆتەوە بەندە، سروشتیشت دەرەنجامی هەڵسوکەوت‌و هەڵچوونەکانت‌و کاردانەوەکانتە، هەڵس‌وکەوت‌و کاردانەوەکانیشت دووبارەکردنەوەی ئەو کردارانەیە کە بیروبۆچوونەکانت پێت ڕادەگەیەنن، بیروبۆچوونەکانت دەرەنجامی ئەو ئاماژانەیە کە لە لایەن خەڵکی‌و بارودۆخ‌و ئەو ژینگەیەی دەوروبەرت پێت دەگات.

**ژیان فێری کردم:** لە هەموو مرۆڤێکدا لایەنی باش‌و لایەنی خراپ هەیە، پێویستە لەسەرمان لایەنە باشەکە بەهێز بکەین.

**ژیان فێری کردم:** لە هەر بارودۆخێکدا بووی بە ڕوویەکی خۆشەوە سەیری ژیان بکە، فێری خەندەو پێکەنین بە، خەمەکانی جیهان مەدە بە کۆڵی خۆتدا.

**ژیان فێری کردم:** هەوڵ بدە هەموو ڕۆژێك بە سەر دوێنێتدا سەربکەویت، ڕەزامەندی ویژدانت بە دەست بهێنە، پێویستە خۆشحاڵی‌و ئاسوودەییت لە لا گەورەتر بێت، لە پێداهەڵگوتنی هەموو جیهان.

ئەندام عومەر

# بە منداڵەکەت مەڵێ... بەڵکو پێی بڵێ...

**پێی مەڵێ:** ژوورەکەت زۆر شڵەژاوەو ڕێکیبخە!

**پێی بڵێ:** ئایا پێویستت بە یارمەتی نییە، بۆ ڕێکخستنی ژوورەکەت؟

**پێی مەڵێ:** یاری بە تۆپ مەکە لە ماڵەوەو لەسەر شەقام.

**پێی بڵێ:** شوێنی یاریکردن لە باخچە، یاخود یاریگایە، یان لەگەڵ هاوڕێکانت برۆ بۆ یانەیەکی وەرزشی.

**پێی مەڵێ:** وانەکەت بخوێنەو واز لە یاریکردن بهێنە، چونکە وانەکەت گرنگترە.

**پێی بڵێ:** دوای تەواوکردنی ئەرکەکانی خوێندن، برۆ یاری پلەیستەیشن بکە، یان هەر جۆرە یارییەك کە ئارەزووی دەکەیت.

**پێی مەڵێ:** پێویست ناکات من پێت بڵێم، هەستە ددانەکانت بشۆ.

**پێی بڵێ:** تۆ زۆر ژیرو چالاکیت، لەبەرئەوەی ددانەکانت دەشۆیت، بەبێ ئەوەی من پێت بڵێم.

**پێی مەڵێ:** لە بیرت بێت دوای نانخواردن دەستەکانت بشۆ.

**پێی بڵێ:** بۆنی دەستەکانت زۆر خۆشە، دوای ئەوەی کە شۆردت.

**پێی مەڵێ:** لەسەر مێزی نانخواردن دامەنیشە.

**پێی بڵێ:** ئێمە لەسەر کورسی دادەنیشینو لەسەر مێز نان دەخۆین.

**پێی مەڵێ:** لەسەر دیوار، یان لەسەر دەستو قاچت وێنە مەکێشە.

**پێی بڵێ:** لەسەر کاغەز وێنە بکێشە کاتێك کە تەواوت کرد، لەسەر دیواری ژوورەکەت بۆت هەڵدەواسم.

**پێی مەڵێ:** هەڵسە نوێژەکەت بکە، ئەگینا دەچیتە نێو دۆزەخ.

**پێی بڵێ:** وەرە با بە یەکەوە نوێژ بکەین، بۆئەوەی بە یەکەوە بچینە بەهەشت.

**پێی مەڵێ:** ئەو وێنەیە چییە؟ ئەمە کەی وێنەیە کێشاوتە؟

**پێی بڵێ:** ڕەنگە جوانەکانی وێنەکەت سەرسامیان کردوم، هێڵە وەستاوەکانت سەرسامیان کردوم! دەکرێت پێم بڵێی ئەو وێنە جوانانەت مانای چییە؟ ئەو ئۆتۆمبێلە بۆ کوێ دەڕوات؟ پەنجەرەکان بۆچی کراونەتەوە؟

**پێی مەڵێ:** لەسەر دەم مەخەوە.

**پێی بڵێ:** پێشەوامان (سەلامی خوای لێبێت) فێری کردوین کە لەسەر لای ڕاست بخەوین.

**پێی مەڵێ:** شکولاتە مەخۆ، بۆ ددانەکانت خراپە.

**پێی بڵێ:** من حەزدەکەم ڕۆژانە یەکجار شوکولاتە بخۆیت، چونکە تۆ زیرەکیتو بەردەوام ددانەکانت پاك دەکەیتەوە.

پێی مەڵێ: نەزان، بۆ ناتوانیت وەڵامی ئەم پرسیارە بدەیتەوە؟

**پێی بڵێ:** لەگەڵتدام، بەڕاستی وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە پێویستی بە یارمەتییە، بەڵام دەبێت پرسیاری داهاتوو، بە تەنها وەڵام بدەیتەوە، لەبەرئەوەی تۆ زیرەکیت.

**پێی مەڵێ:** کاتێك من لە دەرەوەی ماڵم، هارو هاجی نەکەیتو ئازاری خوشكو براکانی ترت نەدەیت.

**پێی بڵێ:** ئەرکەکانی قوتابخانەت لە یاد نەکەیت، پاشان تەماشای تەلەفزیۆن بکە، لەسەر کاغەز وێنە بکێشەو پاشان ڕەنگی بکە، یاری بە یارییە تازەکانت بکە، یان خانوویەکی جوانم بە میکانۆکانت بۆ دروست بکە... هتد.

بە کورتی: دووربکەوە لە ئاماژەی نەرێنی... لە بەرامبەردا ئاماژەی ئەرێنی بەکاربهێنە.

واباشترە بە بەردەوامی کاتێك ڕێگری شتێك لە منداڵەکەت دەکەیت، هەوڵ بدە لە بری ئەوە شتێکی تری بۆ دابین بکەیت.

بۆ نموونە:

منداڵەکەت ئارەزووی بازدان، دەکات لەسەر جێگەی نووستن.

**پێی بڵێ:** جێگەی نووستن بۆ خەوتنە. ئەگەر ئارەزووی بازدان دەکەیت، دەتوانیت لە حەوشە ئەو یارییە بکەیت.

# دایك چۆن دەبێتە سەرچاوەی زیرەکی منداڵ

و/ عوسمانی حاجی سەلام

## بەشی یەکەم

ئاگاییو زیرەکیو توانای منداڵ لە مەڕ تێبینی کردنو شیکردنەوە بۆ بابەتەکان بەستراون بە کۆمەڵێك هۆکارەوە کە دایك پێشکەشی منداڵی دەکات، ئەمەش لە ماوەی پەروەردەکردنی منداڵدا بە دی دێت کەتێیدا خاڵە لاوازەکانی منداڵ دەگۆڕدرێت بۆ خاڵی بەهێز.

پسپۆرانی قۆناغی سەرەتایی تەمەنی منداڵ بە گرنگترین قۆناغی فێربوونی دادەنێن، دەربارەی ئەمەش تۆی دایك بە کاریگەرترین ئامراز بۆ ئەو کارە دەستنیشان کراویت، هەربۆیە قسەکردنو پێکەنینەکانت لەگەڵیدا، خوێندنەوەتو لاواندنەوەت بۆی، جۆرێکە لە کارلێکی ڕۆژانە کە دەبنە هۆی بەهێزکردنی ژیری منداڵ، لێرەدا کۆمەڵێك ڕێگا دەخەینەڕوو بۆ قۆناغە جیاوازەکانی تەمەنی منداڵ بۆئەوەی لە ڕێگەیانەوە منداڵەکەت زیاتر بە ئاگاو وریاو زیرەکتر دەربچێت لە داهاتوودا.

رێنمایی بۆ منداڵی تەمەن تازە لە دایکبوو تا تەمەنی یەك ساڵی:

- نیگای چاوەکان:

هەوڵبدە سوود لەو کاتانە وەربگریت کە چاوەکانی منداڵەکەت کراوەتەوە ڕاستەوخۆ سەیری ناو چاوەکانی بکە، چونکە منداڵ لەو تەمەنەدا دەتوانێت جیاوازی نێوان ڕووخسارەکان بکات بە تایبەت دەمو چاوی دایکی لە هەر نیگایەکی منداڵەکەشدا بۆ دایکی زیاتر، وەکو خولێك وایە بۆ بەهێزکردنی هەستەکانو یادگارییەکانی لای منداڵ.

پێدانی شیری مەمك.. ئاگایی منداڵەکەت بەهێزتردەکات:

هیچ کام لە پزیشکانی پسپۆران لارییان لە گرنگی شیرپێدانی مەمکی دایك بە منداڵ نییە، شیرپێدانی دایك بە سوودە بۆ پێکهێنانو گەشەکردنی منداڵ لە ڕووی جەستەییو دەروونییەوە، توێژینەوەکانیش ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەوانەی بە منداڵی شیری دایکیان پێدراوە خاوەنی ڕێژەیەکی زیاترن لە زیرەکیو توانای شیکردنەوە، چەند جوانو بە سوودە ئەگەر لە کاتی شیرپێداندا گۆرانی بۆ منداڵەکەت بڵێی، یان دەست بێنی بە سەریدا بۆئەوەی زیاتر هەست بە سۆزو خاوبوونەوە بکات.

پێکەنین گرنگە بۆمنداڵ:

ختوکەی بدەو گاڵتەی لەگەڵدا بکە، هەمیشە ڕووخۆشبە بەرامبەری باجووڵەکانی ڕووخسارت خەمڕەوێنی بنوێنن، چونکە پێکەنین یەکەم هەنگاوی گەشەکردنی هەستی ڕووخۆشیو گاڵتەیە لای منداڵ، هەروەها لە پێناو هەستکردنی بە خۆشحاڵی، چونکە کاردانەوەی پۆزەتیڤی دەبێت لەسەر تەندروستی منداڵ.

من ئەوم.. یان ئەو منە:

منداڵەکەت لە بەردەم ئاوێنە دابنێ، بۆئەوەی تەماشای خۆی بکاتو شارەزای خۆیو پێکهاتەکانی جەستەی خۆی بێت، لە سەرەتادا واهەستدەکات کە سەیری کەسێکی تر دەکات، بەڵام لەگەڵ تێپەڕینی کاتدا خۆی دەناسێتەوەو خۆی خۆشدەوێت.

ڕێنمایی بۆ منداڵی تەمەن یەك ساڵی تا تەمەنی سێ ساڵان:

ڕێنیشاندانی ناسینەوەی جەستەیی خۆی:

ئەندامەکانی جەستەی خۆی پێ بناسێنەو داوای لێبکە کە دەستی لێبدات، بەڵام پێشبینی ئەوەی لێمەکە بە یەکەم جار زانیارییەکان لەبەر بکات، ئەم کارە کاتی دەوێت.

یاریکردن لە زیرەکیو هۆشیاری منداڵ زیاد دەکات:

یاری لەگەڵدا بکە، بەڵام دووربکەوە لە وتنی وتەکانی (ناتوانی لە دەستی من هەڵبێی)، (ئێستا دەتگرمەوە)... هتد، چونکە بەم وتانە فێری دەکەیت پێشبینی ڕوودانی ڕووداو بکات، هەروەها فێری کاردانەوەی خێرای لێدەکەی، کاتی پێویستی بۆتەرخان بکە لە یاریکردندا، ئاگاداری هەڵبژاردنی جۆری یارییەکانی منداڵ بە، ئەو یاریانەی بۆ هەڵبژێرە کە بیرکردنەوەی پێویستە لە گەیشتن بە ئەنجام، یان ئەوانەی یارمەتی گەشەکردنی جەستەییو هزریو هەستی منداڵ دەدەن هەوڵبدە یاری لەگەڵدا بکەو پرسیاری لێبکە دەربارەی یاریو کەرەستەکانی یاریکردن.

ئاگادارکردنەوە پاشان کردار:

فێری هۆکارو گرنگی ڕووداوەکانی بکە، لە سەرەتادا ئاگاداری بکەرەوە لەو کارەی بە نیازیی پێی هەستی بۆ نموونە: پێی بڵێ کاتی نووستن نزیك بووەتەوە، ئێستا ڕووناکییەکان دەکوژێنمەوە، ئەمە پێش ئەوەی هەستی بە کوژاندنەوەیان.

ڕێنیشاندەری منداڵەکەت بە لە پەڕاندنەوەی ڕێگرییەکانیدا:

گرفتێك نییە ئەگەر ڕێگری ئاسان لە ڕێگاکەیدا دابنێی کە نەبێتە هۆی زیانگەیاندن پێی، پاشان فێری بکە چۆن بپەڕێتەوە لێی وەك گاگۆڵکێ بە ژێریدا، یان بازدان بەسەریدا، یان هەتا ڕۆیشتن بە تەنیشتیدا.

خاوەنی بڕیار.. بۆ هەندێ کات:

هەڵەیە گەر وابزانی هێشتا زووە بۆ یارمەتیدان لە بنیاتنانی باوەڕ بە خۆبوونیدا قۆناغی منداڵی بەردی بناغەی ئەم کارەیە، بۆیە بهێڵە با هەندێجار خۆی خاوەن بڕیار بێت لە هەڵبژاردنی ئەوەی دەیەوێت وەك خواردن، یان جلو بەرگ، ڕێگەی پێ بدە لە نێوان چەند هەڵبژاردەیەکدا خۆی بڕیار بدات، سەرزەنشتیشی مەکە کاتێك بە دەنگی بەرز هاواری کرد، یان یەکەمجار، یان تەنانەت چەندجارێکیش شکستی هێنا.

# بیجۆیەکی (٢٠٦)ی مارۆنی

ڕاز هەڵەبجەیی

کۆرش ئامۆزای من نەبوو، بەڵام دایکیم بە ئامۆژنو باوکیم بە مامە بانگ دەکرد، تیکەڵاویو هاوڕێیەتی خانەوادەی ئێمە لەگەڵ ئەوان دەگەڕایەوە بۆ بیستو سێ ساڵ لەوەوپێش، کاتێك کە من تازە لە دایکبووم کۆرش سێ ساڵان بوو، دایکم دەیگوت، یەك هەفتە پێش لە دایکبوونی من خاوەن ماڵەکەمان کە پیاوێکی زۆر چروك بوو، بە باوکم دەڵێت لەبەرئەوەی دەبنە سێ کەس دەبێ کرێی خانووەکەم بۆ زیاد بکەن، لەو کاتەشدا باوکم هەرچییەکی بووە دایناوە بۆ دایکم کە بە هۆی سکپڕییەوە نەخۆش بووەو داوای مۆڵەتی یەك مانگیشی لە خاوەن خانووەکە کردووە، بەڵام ئەو کابرا چروكو پولەکییە دیاربوو کەسێکی چەوری دەست کەوتبوو، ئەم مۆڵەتەی بە باوکم نەداوە، هەر بەو شێوەیە لەگەڵ ڕۆیشتنی دایکم بۆ نەخۆشخانە باوکم یەکسەر شتومەکەکانمان دەباتە مەخزەنی یەکێك لە دراوسێکان، بۆئەوەی تا دوای دەرکردنی دایکم لە نەخۆشخانە خانوویەکی دیکەمان بۆ پەیدا بکات، هەر لەو کاتەدا بووە کە دایکی کۆرش بۆ لە دایکبوونی منداڵی داهاتووی لە نەخۆشخانە بووە. لەگەڵ دایکی مندا لە یەك ژووردا بوون، کاتێك دەبیستێت خاوەن ماڵەکەی ئێمە چی لەگەڵ ئێمە کردووە، لەگەڵ هاوسەرەکەی قسە دەکات تا بە شێوەیەکی کاتی لە ماڵی ئەوان بژین، لەگەڵ دایكو باوکی من کە من منداڵ بووم، چل ڕۆژ زیاتر لە ماڵی ئەوان درێژەی نەکێشا، بەڵام بە قسەی باوکم پێداگری باوکی کۆرشو خۆشەویستیو ڕێزی خانەوادەکەی ئەوەندە کاریگەری لەسەر ئێمە هەبوو کە تا ئەو ڕادەیەش کە ئێمە خانوومان بە کرێ گرت، هەڵبەتە دوای دووساڵیش خانوومان کڕی، ئەم خزمایەتیو هاوڕێیەتییەی ئەوان لەگەڵ ئێمە درێژەی کێشا، تا ئەوەی کە هاوکات لەگەڵ ڕۆیشتنی کۆرش بۆ زانکۆو وەرگرتنی دیبلۆمی من، ڕۆژێك خوشکەکەی کۆرش کە هاوتەمەنی من بوو پێشنیاری زەماوەندی براکەی بۆ هێنامو...

هەرگیز تێنەگەیشتم بۆ؟ بەڵام بە تەواوەتی ئەو ساتەبوو کە خۆشم لێی نەدەهات، لە کاتێکدا ئەو کوڕێکی گەنجی جوانو خۆش قیافەبوو، لەگەڵ ئەوەی کە باوکی دوکانی فەرش فرۆشی هەبوو، خۆشی خوێندکاری زانکۆ بوو لە بەشی کارەبا، هەموو ئەمانە دەیان توانی کۆرش بەرەو داهاتوویەکی باش بەرن..

هەرچەند کۆرش زیاتر خۆشەویستی خۆی بۆ دەردەبڕی، بەڵام من زیاتر لێی دووردەکەوتمەوە، تەنانەت ڕۆژێك ڕاستەوخۆ لەگەڵ خۆم قسەی کردو وتی: بۆچی ڕقت لە منەو منت خۆش ناوێت؟

منیش وەڵامێکی ڕاستگۆیانەم دایەوەو وتم: خۆشەویستی بۆچیو بەڵام ناناسێت!

ئەو ڕۆژە کۆرش تەنها سەیری دەکردمو هیچی نە دەوت، بەڵام لەگەڵ ئەو پەیوەندییە ساردو سڕەی منو کۆرش دا پەیوەندی خانەوادەی ئەوان لەگەڵ خانەوادەی ئێمە زۆر بەهێزبوو، بە تایبەتی دایكو باوکی منو دایكو باوکی ئەو، هەرچەند هەستیان کردبوو کە کۆرش حەز دەکات هاوسەرگیری لەگەڵ

مندا بکات، بەڵام لە مەسەلەکانی تر بێ ئاگابوون، هەروەها هاتووچۆشمان هەر بەردەوام بوو، تەنانەت منیش دەچووم بۆ ماڵیان تا ئەو ڕۆژەی کە لە ماڵی ئەوان هاتمەدەرەوە، لەسەر کۆڵانەکە ویستم بە تەکسی بڕۆمەوە بیجۆیەکی ٢٠٦ی مارۆنی لە بەردەممدا ڕاوەستا، کەمێك ترسام، پاشان وتم:

- تکا دەکەم بێزارم مەکە، بەڵام شۆفێرەکە گەنجێکی ڕۆح سوکی جوان بوو، بە شێوازێکی میهرەبانانە وتی:

- تکا دەکەم خانم...! من دراوسێی ماڵی کۆرشم لەبەرئەوەی دەزانم ئێوە خزمی ئەوانن ویستم ئەرکی خۆم ئەنجام بدەم، بەڵام ئەگەر وا هەست دەکەن من بێزارتان دەکەم، ئەوا دەڕۆم.

کوڕە گەنجەکە ئەمەی وتو ویستی بڕوات، دووبارە وتی:- بڕۆم؟

خۆزگە وتبام بڕۆ، یان وەڵامم نە دایەتەوە! بەڵام بە داخەوە ڕاستگۆیانە بڵێم چاوی کاکی شۆفێر مەستی کردم، بە بێ ئاگا سواری ئوتومبێلەکەی بووم، تەنها بەو نییەتەی تا ماڵی خۆمان بمگەیەنێت، بەڵام جەمشید باش شارەزابوو کە کچێکی سادەی وەکو من چۆن بۆ لای خۆی ڕاکێشێت، بە جۆرێك بە قسەکانی منی نوقمی خەیاڵات کردبوو، دوای سێ کاتژمێر کە لە ئۆتۆمبێلەکەی دابەزیم هەستم کرد کاریگەی لەسەر جێهێشتووم، ئەو شەوە تا بەیانی بە خەیاڵی شیرینی جەمشیدەوە نوستم، سبەینێ لە هەمان ئەو کاتەدا کە بڕیارمان دابوو لەماڵ چومە دەرەوە، چوم بۆ دیتنیو دووسبەیو سێ ڕۆژی ترو......هتد.

بە تەواوی ئەو ڕۆژانە خۆم بە خۆشبەخترین کچی دنیا دەزانی، ڕۆژی پێنجەم کۆرش هاتە لام بەبێ ئەوەی لەگەڵ ماڵەوەمان قسە بکات لێی پرسیم:

- تۆ دەزانی لەگەڵ کێ بوویت بە هاوڕێ؟ هەڵبەت پەیمانی زەماوەندیشی پێداویت؟حەزدەکەیت من کە خەڵکی گەڕەکی ئەوانم شتێکت لە بارەی جەمشیدەوە پێ بڵێم؟!

بەو بڕوایەی کۆرش لە حەسودی خۆیەوە دەیەوێت عەشقی شیرینی منو جەمشید تێك بدات، تەنانەت ڕێگەم پێ نەدا قسەکانی تەواو بکات، تەنها وتم:

- نامەوێت لەو بارەیەوە هیچ شتێك ببیستم. کۆرش سەرێکی لە قاندو قسەی نەکردو ڕۆیشت، تا من ڕۆژە خۆشەکانم بەرمە سەر، تا ئەو کاتە کە ڕۆژە شومەکە گەیشت، نزیکەی سێ هەفتە لە ناسینی منو جەمشید تێپەڕی، ڕۆژێك پێی وتم: ئەگەر ڕازی بیت ئەمڕۆ دەچین بۆ باخەکەی ماڵی خاڵم، ئەوەی بیرم لێ نەکردبێتەوە ئەوەبوو کە جەمشید تەڵەی بۆ نابێتمەوە!

تەنها ئەوەندەم زانی کە لەگەڵ ئەودا چووینە باخەکەوە لە ناوچەی (لویزان)بوو، لە کاتێکدا بێ ئاگا بینیم دوو هاوڕێی جەمشید کە مەست ببوون، بەرەو ڕووم هاتنو پێشوازییان لێ کردم، یەکسەر زانیم چی چاوەڕێمە هەر لەبەرئەوە ویستم بچمە دەرەوە، بەڵام جەمشید وەکو گورگ بەرەو ڕووم هاتو وتی:

- بۆ کوێ؟ دەمێکە چاوەڕێی ئەم ساتە دەکەم، بە تەواوی هێزم هاوارم کرد:

- خوایەگیان فریام کەوە.

ئەو سێ کەسە دەستیان کرد بە پێکەنین... وەك ئەوەی پێم بڵێن دەنگت بە کەس ڕاناگاتو ئێمەش دەمێکە چاوەڕوانی ئەم ڕۆژە دەکەین، لە ناکاو دەرگاکە کرایەوە، ئەوەی من چاوەڕوانم نەدەکرد ڕوویدا، تۆ بڵێی چ دڵسۆزێك بێت وەکو فریشتە بە هانامەوە هاتووە، ڕەنگە بڕواکردنی دژوار بێت، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو کەسە کۆرش بوو!! لەو کاتەدا مۆبایلەکەش بە دەستییەوە بوو ڕووی کردە ئەو گورگانەی لە پێستی مەڕدا خۆیان مەڵاس دابوو و وتی: پیلانە ژەهراوییەکەتان بێ ئاکام بوو، ئیدی بەسە، تەلەفۆنم بۆ پۆلیس کردووەو ئێستاش لەسەر هێڵن ناو نیشانەکەشم پێداون پێیان بڵێم بێنە ئێرە؟ یان لەسەر ڕێگەی ئەو کچە دەچنە کەنارو وازی لێ دەهێنن؟ ئەوانیش کە زۆر ترسابوون وازیان لێ هێناو منیش بە ڕاکردن بەرەو لای کۆرش ڕۆیشتم! لە شەرمەزاریدا ڕووم نەدەهات سەیری ناوچەوانی بکەم، سەرەڕای هەموو هەستە خراپەکانی من بەرامبەر بە کۆرش، ئەمڕۆ ئەو هەموو ژیانی کڕیمەوەو لە دەمی گورگەکانی سەردەم ڕزگاری کردم...

ئێستا کە سەرقاڵی نووسینی ئەم ڕووداوەم، تا کچانی هاو تەمەنم پەندی لێ وەربگرنو قسەی باقو بریقەدارو ئۆتۆمبێلی مۆدێل بەرزو... هتد، کاریگەریان لەسەر دروست نەکات، دوو مانگ لەو ڕۆژە ناخۆشە کە خەریکبوو هەموو ژیانم لێ تێکبدات، تێ پەڕیووە، کۆرش ئەوەندە مەردە کە تا ئێستاش ئەو ڕووداوەی لای هیچ کەس باس نەکردووە، بەڵام نازانم کە ئەو هێشتا ئامادەیە هاوسەرگیریم لەگەڵدا بکات، یان نا؟ خۆزگە دەخوازم ڕۆژێك دابێت بتوانم پاداشتی ئەو چاکە گەورەیەی کۆرش بدەمەوە...

سەرچاوە/ گۆڤاری روزهای زندگی/ژ.٢٥٢

# 10 ئامۆژگاری باوکێك بۆ کوڕەکەی

کوڕی شیرینم، گەر دەتەوێت بەختەوەرو شادمانو سەرکەوتوو بیت، ئەوا ڕەچاوی ئەم ئامۆژگاریانە بکەو هەوڵ بدە یەك بە یەکیان جێبەجێ بکەیتو هیچ کام لەوان فەرامۆش نەکەیت:

١- لە بری ماڵو سامان، زانست کۆبکەرەوە.

٢- لە بری هێزو توانات، عەقڵت بەکاربهێنە.

٣- لە بری ڕووخسارت، ناخت جوان بکە.

٤- پێش ئەوەی لە بیری گۆڕانی دەوروبەرو وڵاتو شارو گەڕەکەکەتدا بیت، گۆڕانکاری لە خۆتدا دروست بکە.

٥- لە بری قسەی بێسوود، بێ دەنگی هەڵبژێرە.

٦- لە بری دونیا، بۆ دوارۆژ هەوڵبدە.

٧- لە بری خەمخواردنو ئاخ هەڵکێشان، بە دوای چارەسەردا بگەڕێ.

٨- لە بری ئەوەی دڵێك لە خۆت بڕەنجێنیت، دڵێکی تر بکەرە هاوڕێت.

٩- لە بری تاڵی، شیرینی ببەخشە.

١٠- لە بری گومانی خراپ، هەمیشە پشوو درێژبە تا ڕاستییەکان دەردەکەون.

دیمەن حەیدەر

# لە یەکەم بەیەکگەیشتندا چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ بەرامبەرەکەتدا دەکەیت؟

یەکترناسین ئەڵقەی پێکەوە بەستنی هەموو جۆرە پەیوەندییەکە لە نێوان مرۆڤەکاندا، بەو پێیەی هەرجۆرە پەیوەستییەك کە لە نێوان مرۆڤەکاندا دروستدەبێت لە یەکەم دیداری یەکترناسینەوە سەرچاوەی گرتووە، بابەتەکەی ئێمە لێرەدا چۆنییەتی هەڵسوکەوت لە نێوان دوو ڕەگەزی جیاوازدا، یاخود لەگەڵ ڕەگەزی بەرامبەردا دەگرێتەوە، بە تایبەتی چۆنییەتی هەڵسوکەوتی ڕەگەزی نێرینە لەگەڵ ڕەگەزی مێیینە، بەو پێیەی سروشتی ڕەگەزی مێ زیاتر ڕەگەزێکی هەستیارە، یاخود حەساسەو تێڕوانینێکی وردی بۆ هەڵسوکەوتەکانی ڕەگەزی بەرامبەر هەیەو زۆر جار بە دیتنی تەنها چەند هەڵسوکەوتێکی کەمی ڕەگەزی بەرامبەری توانای دیاریکردنی کەسێتی بەرامبەری دەبێت ئەگەرچی لە ماوەیەکی کەمیشدا بێت.

زۆرجار گوێ بیست دەبین بێزار دەکرێن لە ئەنجامی باش شارەزا نەبوونی ڕەگەزی بەرامبەر لە سروشتی ڕەگەزی مێ بۆ یەکتر ناسینێکی تەندروستو بێخەوش جا بە هەر مەبەستێکو لە هەر کاتو شوێنێکدا بێت پێویستە پیاوان ڕەچاوی ئەم خاڵانەی لای خوارەوە بکەن:

١- بەڕێزەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ بەرامبەرەکەتدا بکەو هەوڵبدە وەك هاوڕەگەزێکی خۆت، یاخود هاوڕێیەك تەماشای بکەیت.

٢-پێویست ناکات تەوقەی لەگەڵدا بکەیت، چونکە ڕەنگە کەسی بەرامبەر پێی خۆش نەبێت، یاخود نەیەوێت تەوقەت لەگەڵدا بکات.

٣- بە ئاسایی مامەڵەی لەگەڵدا بکەو لە کاتی گفتوگۆکردندا سەرنجت لەسەر شوێنێکی دیاریکراو چڕ مەکەرەوە، بۆ نموونە چاوبڕینە چاوی بەشێوەیەکی نائاسایی، چونکە ڕەنگە لایەنی بەرامبەر بێزار بکەیتو تووشی ئیحراجی بکەیتو دواتر هەڵە تێگەشتنێك ڕوو بدات، یاخود دەرئەنجامێکی خراپی هەبێتو دواتر ببێتە خاڵێکی لاواز بەسەرتەوە.

٤- ئەگەر لە کاتی یەکترناسینەکەدا ڕووداوێکی سەیر ڕوویدا کە ناچار بە پێکەنین بیت، پێویست ناکات بە قاقا، یان دەنگی بەرز پێبکەنیت، چونکە بەم شێوەیە متمانەی بەرامبەر لە دەست دەدەیت.

٥- بە وردیو جوانی گوێ بۆ قسەکانی ڕابگرەو ڕێز لە بیروبۆچوونەکانی بگرەو هەوڵ بدە لە مەبەستی تێبگەیت، بۆئەوەی بتوانیت وەڵامێکی گونجاوی بدەیتەوە هەست بکات کە وتەکانی جێی گرنگی پێدانی تۆیە.

٦- لە کۆتایی بە یەکگەشتنەکەدا پرسیار لە هەر پێویستییەك، یان جێبەجێکردنی کارێك کە لەوانەیە کەسی بەرامبەر توانای بەدەستهێنان، یاخود جێبەجێکردنی نەبێت بەو پێیەی لە وڵاتی ئێمەدا ڕەگەزی مێ زۆرجار تواناکانی سنوردارە بۆ بە دەستهێنانی هەندێ پێداویستی، یان ڕاپەڕاندنی هەندێك کار، لەچەند شوێنێکی تایبەتدا بۆ نموونە فەرمانگەیەکی دەوڵەت زۆر جەنجاڵو قەرەباڵغ، یان لەو شوێنانەی بوونی ڕەگەزی نێری تێدا زیاتر بێت، ئەمەش ڕێگر بێت لە ئاسان ڕاپەڕاندنی کارەکانی ڕەگەزی مێیینە.

هیوادارم ئەم چەند خاڵە توانیبێتی ئاسانکارییەك بە تۆ پێشکەش بکات بۆ بەرز ڕاگرتنی کەسێتیت، یان درێژەدان بە پەیوەندییەکانت لە هەر جۆرە پەیوەندییەکی ڕاستو دروست کە جێی گرنگی پێدانت بێت، دڵنیام ئەگەر بەمشێوەیە ڕەفتار بکەیت کاردانەوەیەکی ئەرێنیو باشی لەسەرت دەبێتو زیاد لە پێویست جێگەی باوەڕو گرنگی پێدانی بەرامبەرەکەت دەبیتو دەبیتە جێگەی ڕێزی هەمووان.

# نامەیەك بۆ پەروەردەكاران

گولان حەمە ئەمین

پەروەردەكارانی ماندوونەناس سڵاو لە تەمەنی خزمەتو هزری ماندوو زمانی پاراوو دەستی خزمەتتان... ئێوە لە مێژە وانەی پەروەردە دەڵێنەوە، هەر كات گوێبیستی وتەی كەسێك لە ئێوەی باپیرە، داپیرە، دایك، باوك، مامۆستا، خوشكو برای گەورە)... دەبم، وادەزانم گوێبیستی مێژوویەكی درێژخایەنی ئەزموونی ژیان دەبم، یاخود وادەزانم سەردانی كتێب خانەیەكم كردووەو وانەكانی ژیان فێربووم، ئێوەی ماندوو نەوەیەكی نوێتان خستە كایەی ژیانەوە، هەر لەو ساتە ناسكەی بە گریانەوە سڵاوی لە ژیان كردو دەمی بادەدا بۆ دڵۆپێك شیر تا خەوتنو خواردنو دارە دارەو قسەو پێكەنینو یاریكردن، خوێندنو خواناسینو كاركردنو خۆناسینو خەڵك ناسین، تا ئەو كاتەی چینێكتان كردە دەسەڵاتدار، چینێك پزیشكو چینێك مامۆستاو چینێك زاناو چینێك پیشەوەرو...هتد، هیچتان فەرامۆش نەكرد، بەم كارە گەورەیەش درێژەتان بە ڕەوتی ژیانو پێشكەوتنو سەركەوتن دا، دووبارە ماندوونەبن.

بەڵام لە بیرتان بێت ساتێكیش لە جێی سكاڵا ڕابمێنن، خۆ ئەو ساتەی هاتینە دونیا پەڕەیەكی سپی بووین، نە درۆ، نە فریودان، نە ڕقو كینەو نە شەڕو هەرا، نە دەستبڕین، نە هیچ ڕەوشتێكی نا پەسەند، هیچمان نەدەزانی، ئێوەی ئازیز لەگەڵ فڕێدانی هەرمشتێ لە تۆوی چاكەو مرۆڤ دۆستیو ڕاستیو پاكی، بێ ئەوەی بزانن تۆوێكی خراپیشتان فڕێدەدا، نەتان دەزانی كە سەرجەم تۆوەكان پێكەوە گەشە دەكەن، ئێوە لە یادتان نەبوو ئێمە وێنەی هەموو چركەكانتان لە ڕۆشتنماندا تۆمار دەكەینو لە داهاتوودا بۆتان نمایش دەكەینەوە، ببورن كە ئێستا دەبینن وەك منداڵی سینەسافو بێگەرد نین، لەو ساتەوە فێری ڕق بووین كە لێنەگەڕان لە جیهانە پاكەكەی منداڵیماندا میوانەكان بخەینە پێكەنین، دەتان گوت گەر فلان وای وت ئاوا بڵێ، نەچیتە لای فلانو... ببەخشن ئەو كاتەی ئەركی ماڵەوەمان جێبەجێ نەكردایە بە هێمنی بەڵێنی چكلێتێكتان پێ نەدەداین تا بۆ ڕۆژی دواتر لە پێش هەمووانەوە ئامادەی بكەین، بەڵكو لە پێش چاوی هاوپۆلەكانمانەوە دەستە ناسكۆڵەكانتان بە دارسور دەكردینەوە!

نامانەوێت لە ماندووبوونتان بێ باك بین، بەڵام لە بیرتانە لە پێش هەواڵپرسینا هەموو ئەو قسانەتان پێ دەدركاندین كە لە میوان دارییەكدا گوێبیستی بووبووین، حەزتان بە ئاشتیو خۆشەویستی بوو، بەڵام زۆرجار باسی خراپەی هاوڕێو خزمانتان دەكردو بەڵێنتان دەدا كە چی دی سەردانیان نەكەن، فێری ڕاستگۆییتان دەكردین، بەڵام كە لە دەرگا دەدرا دەتان فەرموو گەر فلان بوو، بڵێ لە ماڵ نییە!

هەموو ئاواتێكتان بە داهاتووی ئێمە بوو، بەڵام كاتێك پرسیارێكمان ئاراستە دەكردن تاڕیساكانی ژیان فێر ببین هاوارتان دەكرد بێزاربووم، پرسیاری تۆ تەواونەبوو!!

لە بیرتان نەبوو ئێوە وەك ڕاهێنەری سەربازگەیەك وان چی ئەنجام بدەنو چی بڵێن خێرا ئێمەش دووبارەی دەكەینەوە نە بادا سزا بدرێین، ئێستاش ببەخشن لە هەڵەكانمان هەموو سەركەوتنو فێربوونێكمان بە بەرهەمی ئێوەی بەڕێز دەزانین، بەڵام لە هەموو ساتەكانی ژیانیشماندا ئاوێنەی مێژووی ڕابردووتانین، لاوانی خۆشەویست لە بیرمان بێت ئێمەش پەروەردەكارانی نەوەی دوای خۆمانین، نەوەی داهاتووش ئاوێنەی ڕەوشتی ئێمە دەبن با هەموو ساتێك ئەوەمان لە یاد بێت چ تۆوێك فڕێ بدەین، بە دڵنیاییەوە سەوزدەبێت! كەوایە بۆچی سوودبەخشترین تۆو نەچێنین؟! تا لە دوارۆژدا لە بەرهەمی سودمەند ببین!

ئا: کامەران محەممەد ئەمین

# منداڵ و پێکەنین

بەشی دووەمو کۆتایی

* ئایا مرۆڤەکان هەموویان وەکو یەک پێدەکەنن؟

لە وەڵامدا دەڵێین نەخێر جیاوازی هەیە لە نێوان منداڵو گەورەدا، لەبەرئەوەی منداڵ بە شێوەیەکی بەردەوام سەرقاڵی ئاشکراکردنی نهێنی چواردەوریەتی، لەبەرئەوە هەر شتێك کەمێك کۆمیدی بێت دەیخاتە پێکەنین، کاتێکیش منداڵ بە تەواوەتی دەست دەکات بە پێکەنین لە تەمەنی (٤) ساڵییەوە تێکەڵاوی دونیای زەردەخەنەو پێکەنین دەبێت، هەتا ئەگەر ئەو منداڵانە کەمئەندامو ناتەواویش بن، وەك کەرو کوێری، چێژ لە پێکەنین وەردەگرنو لەگەڵیدا دەژین، (ویلیام فرای) پرۆفیسۆری دەروونناسی ئەم بۆچوونە زیاتر پشت ڕاست دەکاتەوەو دەڵێت: منداڵ بە ڕێژەی (٣٠٠-٤٠٠) جار لە ڕۆژێکدا پێدەکەنێت، بەڵام گەنجێك (١٥-٢٠) جار لە ڕۆژێکدا پێدەکەنێت، واتە تا تەمەن درێژتر بێت لایەنی کۆمەڵایەتیو ڕەگەزی پێکەنین کەمتر دەبێت.

* لە چ کاتێکدا پێکەنین دروستە؟

پێویستە پێکەنین لە شوێنی گونجاو و شێوەی خۆیدا بێت، لەگەڵ ئەوەی کۆنترۆڵ کردنی منداڵ جیاوازترە بۆ کپکردنەوەی، چونکە پێکەنینی منداڵێك پێکەنینێکی پاکو بێگەردو ڕاستەقینەیە، بەو ڕادەیە نابێتە جێگەی گلەیی، بەڵام بۆ چینی گەنجو هەرزەکارو بە تەمەنەکان، سنووری پێکەنین بە هەند وەردەگیرێت، پێویستە هەوڵبدەین ئەم پێکەنینە لە خەندەیەکی جوانەوە نەگوازینەوە بۆ خەسڵەتێکی بێزارو قێزەون، بە داخەوە تا ئەمڕۆش لە کاتی کارەساتو پرسەو ماتەمینییەکاندا لێرەو لەوێ کەسانێك دەبینین بە دیمەنێکی نەخوازراوەوە قاقای گەورە لێ دەدەنو پێکەنینێکی درێژ دەکەنە پیشەیان کە تا سەر ئێسقان ئەمە شتێکی جوانو شیاو نییە، ئێمە زۆرجار نازانین پێکەنین لە شوێنی خۆیدا بەکار بهێنین، هەر بۆیەش لای ئێمە بە هەڵە لێکدەدرێتەوەو پێناسەی جیاواز بۆ لێکدانەوەی پێکەنینی کەسایەتییەکان دەکرێت، پێکەنینی منداڵ بە جیاوازتر لەگەڵ گەورەیەکدا سەیر دەکرێت.

* چۆن ڕێنمایی بدەینە منداڵان بۆ پێکەنین؟

بزەی منداڵی سەرەتاییو سوکە پێکەنین کارێکی شیاوە، بەڵام پێویستە کە زۆر پێکەنین بە دەنگی بەرز نەبێت، ئەوەندەی دەتوانینو بۆمان دەکرێت پێکەنین لە شوێنە گشتییەکاندا کەم بکەینەوە، وەك ناو پاسو هۆڵو گازینۆو کافتریاو دامو دەزگا حکومییەکانو... هتد، ئەگەر ئەم پێکەنینەش بە ویستوخواستی خۆمان نەبێت و لە ژێر کۆنترۆڵی خۆماندا نەبێت، ئەوا هەوڵبدەین بتوانین ماوەی پێکەنینەکە زۆرو بەردەوام نەبێت کە کار لە دەوروبەر بکات، پێکەنین نەکەینە هۆکار کاتێك کەسێکی نامۆ دەبینین کە بە هەر چەشنو شێوەیەك دەرکەوێت، پێویستە پێی پێنەکەنین، چونکە ڕەنگدانەوەی خراپی لێ دروست دەبێت، ڕەنگە ئەمە لە بەرژەوەندیدا نەبێتو بە زیان بشکێتەوە، ڕێگا بە منداڵانی سادەو ساکار نەدەین گاڵتە بە کەسانی تر بکەنو پێکەنینی گاڵتە ئامێزانە ئەنجام بدەن.

* هەموو کەسەکان وەك یەك کاریگەرن بۆ دروستکردنی پێکەنین؟

دەڵێین: نەخێر ڕووخۆشیو دروستکردنی هێنانی بزەو خەندە بۆ بەرامبەر پێویستی بە کەسانی نوکتە بازو سەلیقەو پسپۆڕی ئەم بوارە هەیە، هەندێ کەس زیاتر ئەوەندە بە ڕووخۆشییەوە قسەو نوکتە بەخۆشییەوە دەکات، بە دەست خۆت نییە بە پێکەنینت دەهێنێت، بەڵام هەندێ کەس هەمان شت دووبارە دەکاتەوەو لێی نایەت کەسیش بە پێکەنین ناهێنێت.

* جۆرەکانی پێکەنین:

١- پێکەنینی سروشتی: هەموو ئەو پێکەنینانە دەگرێتەوە کە بەبێ هۆکار دێنە ئاراوە نموونە، ئەو مرۆڤانەی هەر خۆیان لە ساتی لەدایکبوونیانەوە ڕووخۆشن، یان دەمو چاویان کۆمیدی هەڵکەوتووە، تەنانەت مرۆڤە کەم هۆشەکانیش کە بەردەوام پیشەیان پێکەنینە.

٢- پێکەنینی دروستکراو: لە ئەنجامی فیلمێکی کۆمیدی، کاریکاتێرێك، وێنەیەکی دروستکراو، نوکتە گێڕانەوەیەك، هەڵسوکەوتێکی سەیرو سەمەرە، دروست دەبێت.

* منداڵی ساوا زیاتر هۆگری دایك دەبێت تا باوك:

باوکانی تازە لەم سەردەمەدا دەبینین زۆر کەم دەتوانن وەك باوکێکی تایبەت هەڵسوکەوت بکەن، لەبەر ئەوەی ئەم منداڵە لە سێ مانگی یەکەمو دووەمو سێیەم ئەم باوکە زۆر بە زەحمەت دەتوانێت مامەڵە لەگەڵ ئەم منداڵەی خۆیدا بکات، بۆیەش ناتوانێت لە باوەشی نزیك بێتەوە، چونکە لێی دەترسێت، لە لایەکی ترەوە گیانی منداڵێکی ساوا نەرم و ناسك و بچووکە، دایکانو باوکانیش لەم ساتەدا زیاتر هەست بە ترس دەکەن لەوەی بە لایدا بچن، ئەم منداڵە لەبەر ئەوەی زیاتر تێکەڵە لەگەڵ دایکیدا، کاتێك لاشەی ئەم منداڵە بەهێزو پتەو بوو پاشان هەڵی دەگرنو باوکی یەکەم کەسە کە لێی نزیك دەبێتەوەو هەڵی دەگرێتو دەچێت بە لایەوەو یاری لەگەڵدا دەکات، بەڵام ئەگەر هاتوو ئەو منداڵە تێکەڵ بوو لەگەڵ دەوروبەریداو هەستی پێکرد ئیتر ئەوانیش هەڵدەستن قسەی لە گەڵدا بکەن، یان بە پێکەنینی بهێنن، ئەو کاتە هەستی باوك دەجوڵێت بەرامبەر منداڵەکە، منداڵەکە هەست بە بوونی باوکایەتی دەکاتو لە دەرفەتێك دەگەڕێت قسە لەگەڵ باوکیدا بکاتو بە پێکەنینەوە لەگەڵیدا بدوێت، بەڵام ئەو منداڵە ئەو کات هەست دەکات کە هەستێکی سەیر لە دڵو دەروونیدایە، دەزانێت کە دەوروبەرەکەی حەز دەکەن ئەو ببینن پێبکەنێت، لەبەرئەوە جاری وا هەیە پەنا بۆ پێکەنین دەباتو دەزانێت کە ئەوان بۆ ماوەیەکی زۆرسەیری دەکەن، ئیتر وا هەست دەکاتو شێوازی لێکدانەوەی وادەبێت ئەوەی لە دەوروبەری بێ دەیانناسێتەوەو هەمیشە خەندەی دێت بۆیانو پێدەکەنێت بە ڕوویانەوە، ئەو کەسانەی هەمیشەو بەردەوام خەندە لەسەر لێوی منداڵەکانیانە بە بێ هۆکار، دایكو باوکیان وا لێکی دەدەنەوە کە شتێکی زۆر باشەو تەندروستییەکی زۆر باشی هەیە، هەست بە خۆشیو ئاسودەیی دەکات، دایكو باوکەکەشی هەڵدەستن بە ئەو ئەركو مافەی کە بەسەریانەوەیە لە بەرامبەر ئەو منداڵەدا، بە شێوەیەکی باش بەکاری دەهێنن، ئەم خێزانەش لە بەرامبەردا دڵخۆشو گەشبین دەبن.

* ئامۆژگاری گشتی: لە ساڵی یەکەمدا قسە کردن لەگەڵ منداڵدا شتێکی زۆر سەرەکییە، پێویستە قسەی لەگەڵدا بکرێت بۆئەوەی شت ببیستێت، دانانی منداڵ لەگەڵ یەکێکدا کە زمانی جیاوازەو زمانێکی بیانی هەیە ئەگەر زۆر لەگەڵیدا بمێنێتەوە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ قسەکردنی بە زمانی دایك زۆر باش نابێت، واتا درەنگ فێری زمانی دایك دەبێت.

١- هەمیشە لەگەڵ منداڵەکانتاندا ناوی شتەکان بهێنن، یا لە شوێنە گشتییەکاندا ناوی شوێنەکانی پێ بڵێ، یاخود لە بەر دەمی کتێبخانەیەك، یان کتێبخانەیەکی گشتی، خۆت بکە بە هاوڕێو هاوەڵی منداڵەکەت هەندێ گۆڤارو ڕۆژنامەی پێ بناسێنەو با ناوەکانیان بزانێت.

٢- منداڵ بۆ ماوەیەکی زۆر جێمەهێڵە لە بەرامبەر تەلەفزیۆنو بە بێدەنگی سەیری ئەو دیمەنە جوڵاوانە بکات، هەوڵ بدە قسەی لەگەڵدا بکە، هەموو ڕۆژێك کورتە چیرۆکێکی بۆ باسبکە، پاشان داوای لێبکە کە بۆت باس بکاتەوە، تابزانیت لەبەری کردووە، هەموو هەفتەیەکیش هەوڵ بدە شتێکی تازەی فێر بکەیت.

٣- یارمەتی ئەو مامۆستایانە بدە کە مامۆستای منداڵەکانتن لە فێرکردنو پەروەردەدا، یارمەتی ئەو دایکانە بدە کە منداڵەکەت لەگەڵ منداڵی ئەوان یاری دەکات لەدەرەوەی قوتابخانە.

٤- دوورکەوە لە ڕەخنەی ڕوخێنەرو شکێنەر، هەوڵ بدە تووڕەبوون تێکەڵاوی قسەکانت نەبێت لە بەرامبەر بۆچوونو قسەکانی ئەو منداڵە، مافی بپارێزەو هەوڵ بدە لێرەو لەوێ لەناو منداڵاندا گاڵتەی پێنەکرێت.

٥- منداڵەکەت بە شێوەیەك پەروەردە بکە کە کەسێکی گۆشەگیر دەرنەچێت، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی بۆ فراوان بکەو هەوڵبدە با تێکەڵ بە دنیای منداڵانی تر ببێت.

* زیانەکانی پێکەنین:

لەگەڵ ئەوەی سودی پێکەنینمان زانی، بێگومان پێکەنین زیانیشی بەدواوەیە، ئەگەر هاتو مرۆڤێك زۆر پێبکەنێت پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) فەرموویەتی دڵ دەمرێنێت، بە شێوەیەکی زانستیش پێکەنینی زۆرو لە ڕادەبەدەر کار لەسەر (جهاز عصبی)و (غود دەی دەرەقی)و (جهاز حرکی) دەکات، هەموولایەکیشمان درك بەوە دەکەین بزەی سەرەتایو سوکە پێکەنینی نەرمو ناسك کارێکی شیاوە، بەڵام ئەو کەسەی کە زۆر پێدەکەنێت بە بەردەوامی بێ گوێدانە شوێنو کاتی شیاو، ئەمانە لە ناو خێزانو لە ناو کۆمەڵگاش بەمرۆڤێکی بە هەیبەت تەماشا ناکرێت بڕێك لە کەسایەتیان لە دەست دەدەن.

به هیوای ئایندەیەکی گەشو ڕوون بۆ هەموو لایەك...

# چەند وتەیەکی ڕۆشن لە بارەی خوێندنەوەوە

و: دونیا محسین فاتح

چەندەها جار گوێمان لە قوتابییەك، یان خوێندکارێکی زانکۆ بووە کە دەڵێت: ئیتر تاقەتی خوێندنەوەی ئەم کتێبەم نییە، یان ئەوەندە تاقەتم لەم کتێبە بەسەرچووە کە باس ناکرێت، یاخود هەرچەندە دەخوێنم وەکو ئەوەیە کە کەمتر فێردەبم، یان ١٠ جار خوێندومەتەوەو دووبارەم کردووەتەوە هێشتا فێرنەبووم.

کێشەکە چییە؟ ئایا بۆ فێربوونی وانەکە دەبێت ١٠جار کتێبەکە بخوێنیتەوە؟ ئایا دەبێت وانەکان لە دوای یەك دووبارە بکرێتەوە؟

ئایا دەبێت وانەکە دەها جار دووبارە بکرێتەوە تافێر بیت؟ ئەگەر وابێت خوێندنەوە کارێکی بێ تاقەتو گرانە، بەڵام ڕاستییەکە ئەوەیە کۆمەڵێك لە فەراگیران، شێوازی خوێندنەوە نازانن، بەداخەوە لە خوێندنگاو زانکۆکانیش لەبارەی شێوازی خوێندن فێرناکرێن، فێربوونو خوێندنەوە پەیوەندییەکی پتەوو ڕاستەوانەیان بە یەکەوە هەیە، تا ئاستێك کە دەتوانرێت ئەم دووانە بە پێویست بزانرێت، بۆ ئەوەی میزانی فێربوون زۆر بێت، دەبێت لە هەرشتێکدا خوێندنەوەیەکی زۆر باشت هەبێت.

شێوەی ڕاستو تەواو، ئەم چوار شێوەیە:

١- کاتی خوێندنەوەت زۆر دەکات.

٢- میزانی فێربوونت زۆر دەکات.

٣- کاتی مانەوەی خوێندنەوە لە مێشك زۆر دەکات.

٤- بە بیرهێنانەوەی زانیارییەکان ئاسانتر دەکات.

بۆ بوونی خوێندنەوەیەکی زۆرباش نووسینی بابەتە گرنگەکان لە کاتی خوێندنەوە گرنگە، بۆئەوەی لە کاتی پێداچوونەوە، دووبارە کتێبەکە دەخوێنیتەوەو لە کاتێکی کەمدا لەسەر هەڵگیراوەکانت دووبارەی بکەیتەوە.

هەڵگرتنەوە لەبەر، بەشێکی گرنگە لەخوێندنەوە کە دەبێت گرنگییەکی زۆری پێ بدرێت، چونکە سەرکەوتنی ئێوە تا ئەندازەیەکی زۆر پێوەی پەیوەستە، کاتی فێربوونتان زۆر دەکات، خوێندنی بەبێ هەڵگرتنەوە لەبەر هۆکارێکە گرنگی لە بیرچوونەوەیە.

**شەش شێوازی خوێندنەوە:**

«خوێندنی بەبێ نووسین، خەتڕاکێشان، پەراوێز نووسین، کورتکردنەوە، هەڵگرتنەوەی شتە گرنگەکان، چۆنییەتی هەڵگرتن لە مێشك».

**١- خوێندنی بەبێ نووسین:** شێوەیەکی هەڵەی خوێندنە، خوێندنەوە شتێکی گرنگە کەواتە دەبێت بۆ فێربوون تەواوی بیرت لە لای بێت و بە چاوەکانی خۆت بیخوێنیتەوە، لە کاتی پێویستدا بە بەرزی بیخوێنیتەوە، بەشە گرنگەکانی لێ هەڵگریتەوە بە تەواوی دەرکی پێ بکرێت، تا لە کاتی پێویستدا بە تایبەت لە کاتی تاقیکردنەوە بە خێرایی دووبارەی بکەیتەوە، زۆر بەخێرایی لە مێشکدا دایدنێیتەوە.

**٢- خەتکێشان لە ژێر خاڵە گرنگەکان:** ئەم جۆرە لە جۆرەکەی پێشتر باشترە، بەڵام شێوەیەکی تەواونییە بۆ خوێندن، چونکە لەم شێوازەدا لە جیاتی ئەوەی بیرو مێشکی لە لای فێربوونو دەرکی بابەتەکە بێت، بیری بە لای خەتکێشانەکەوە خەریکە، ئەگەر دەبێت خەتبکێشرێت دەی کەواتە دەبێت یەکەم جار بابەتەکە بە تەواوی بخوێنیتەوەو لێی تێ بگەیت، ئینجا سەرقاڵ بیت بە خەتکێشان لە ژێر بابەتە گرنگەکان.

**٣- پەراوێز نووسین:**

ئەم جۆرە لە جۆرەکەی پێشوو باشترە، بەڵام دووبارە شێوەیەکی باش نییە بۆ تێگەیشتن بەکاربهێنرێت.

**٤- هەڵگرتنەوەی بابەتە گرنگەکان:** هەڵگرتنەوەی بابەتەکان بۆ خوێندنو نووسین شێوەیەکی زۆر باشە، لەم جۆرەدا ئێوە دوای تێگەیشتن لە بابەتەکە بە شێوەی هەڵگرتنەوە بابەتە گرنگەکان دەنووسنەوە، لە ڕاستیدا وشەیەکە کە کورتترینو ئاسانترینو پڕماناترین وشەیە کە بە بینینی تەواوی ڕستەکە دێتەوە بیر.

**٥- کورتکردنەوە:**

لەم شێوەیەدا تەواوی بابەتەکە دەخوێنیتەوە، ئەوەی لێی تێگەیشتوویت بەشێوەی کورتکراوە دەینووسیتەوە، ئەم شێوەیە لە شێوەکانی پێشو باشترە، چونکە لەم بەشەدا ئێوە تەواوی بابەتەکە دەخوێننەوە، ئەوەی لێی تێگەیشتوون دەینووسنەوە.

**٦- دارشتنیو وێناکردنی کەناڵی مێشك:** ئەم شێوەیە باشترین شێوەیە بۆ فێربوون بە تایبەت بۆ وانە هەمەلایەنەکان، لەم شێوەیەدا ئێوە بابەتەکە بە تەواوی دەخوێننەوە دوای تێگەیشتنێکی تەواوی بابەتەکە. بابەتە گرنگەکان بە شێوەی ئۆتۆماتیکی بە زمان دەیڵێنەوە، دوای ئەوە وشەکان بەشێوەی ئۆتۆماتیکی لەسەر کەناڵی مێشك دەنووسینەوە، (لە ڕاستیدا نووسینەکانت بە باشترین شێوە دادەڕێژیتو بابەتە گرنگەکان دەستنیشان دەکەیت)، تا جارێکی تر لە جێی دووبارە خوێندنەوەی کتێبەکە، تەنها لە وێناکردنی بابەتەکە سوود وەرگرن لە ناو مێشکتان، کە بەشێوەی ئۆتۆماتیکی لە ناو مێشکتان وێناتان کردووە، ئەمە زۆر خێرایە، ئەم شێوەیە میزانی سەرکەوتنی ئێوە زۆر دەکات تا ئەندازەیەکی زۆر یارمەتی سەرکەوتنی ئێوە دەدات لە فێربوونو ئاسانتر دەبێت.

**مەرجەکانی خوێندن:**

بەکارهێنانی مەرجەکان، واتە سوود وەرگرتنێکی زۆرتر لە خوێندن.

لە ڕاستیدا ئەم مەرجانە فێرمان دەکات کە پێش دەستپێکردنی خوێندن چی بکەین؟ لە کاتی خوێندن چ شتێك فەراهەم بهێنین؟ چۆن بە ئامانجەکەت بگەیت، بە زانینی ئەمانە دەتوانیت بە ئاگاییەکی زیاترەوە وانەکان دەست

پێبکەیت.

**١- دەستپێکردنێکی ڕاست:** بۆ سەرکەوتن لە خوێندن، دەبێت بە چاکی دەست پێ بکەیت.

**٢- بەرنامەڕێژی:** یەکێك لە مەرجەکانی سەرکەوتن بوونی بەرنامە ڕێژییەکی ڕاستە.

٣- پاکیو ڕێکی: گرنگی هەر شتێك بەڕێکییەوە بەستراوە.

**٤- بوونی ئارامی:** ئارامی گرنگترین مەرجە بۆ سەرکەوتن.

**٥- بە کارهێنانێکی ڕاست لە کات:** بنیامین فرانکلین: (ئایا ژیانتان خۆشدەوێت؟ کەواتە کاتەکان بە فیرۆ مەدەن، چونکە ژیان لە کات پێکهاتووە).

**٦- تەندروستیو لەشساغی:** مێشکێکی تەندروست لە جەستەیەکی تەندروستدایە.

**٧- خواردنی باش:** خواردنی باش ڕۆڵێکی باشی لە لەشساغی دا هەیە.

**٨- دوورە پەرێزی لە خواردنەوە کحولییەکان:** خواردنەوە کحولییەکان دەبێتە هۆی لاواز بوونی مێشك.

**٩- وەرزش:** کلیلی تەمەنێکی درێژترە.

**١٠- خەوتنی پێویست:** هەموو لایەنەکانی مێشك پێ دەگەیەنێت.

**١١- تێگەیشتنی بابەت:** ئەوەی لە مێشکدا بۆ ماوەیەکی درێژخایەن دەمێنێتەوە، واتای بابەتەکەیە.

چەند ئامۆژگارییەکی گرنگ کە دەبێت هەموو خوێندکارانو زانست دۆستان بیزانن:

١- بە لایەنی کەمەوە کاتێك کەسێك دەیەوێت بیر لە بابەتێك بکاتەوە زیاتر لە (٣٠) خولەك نییە، واتە دەبێت هەوڵبدات (٣٠) خولەك بابەتەکە بخوێنێتو بیری لێ بکاتەوە، ماوەی ١٠ تا ١٥ خولەك پشووبدات، دوای ئەوە دووبارە بەوشێوەیە دەست پێبکاتەوە.

٢- پێش خوێندن خۆپارێزی بکەن لە خواردنی چەورو قورس، چەند کاتژمێر دوای نانخواردن دەست بکەن بە خوێندن، چونکە دوای نانخواردنێکی قورس زیاتر کاتێکی دەوێت بۆ هەرسکردنی خواردنەکە، بۆیە لە هەمان کاتدا خوێندن قورساییەکی زۆر دەخاتە سەر مێشکو کار لە بیر کردنەوە دەکات، هەروەها خۆپارێزی بکەن لە خواردنەوە کحولییەکان، هەروەها خواردنە ئاردییەکانی وەکو نانو شەکرو خواردنەوە گازدارییەکان، چونکە هێزی تێگەیشتنی مێشك کەم دەکەنەوە.

# چۆن منداڵەکانمان فێربکەین هاوکاری خەڵکانیتر بکەن؟

**لە فارسییەوە/ سۆران کانی پانکەیی**

نەوەکانت هانبدە تا یارمەتی خەڵکانیتر بدەن، وابکەن تا زیرەکانە ڕووبەڕووی غروریان ببنەوەو، کۆمەکی دەوروبەریان بکەن، ئەم خاڵانەی خوارەوە چەند خاڵێکی کەمن بۆ ئەوەی بتوانیت منداڵەکەت ڕابهێنیت بۆ هاوکاریو یارمەتیدانی کەسانی تر:

١- وردبین بن بۆ ئەو شتانەی ڕوو دەدەن لە چواردەورتان، نمونەیەکی باشبن بۆ نەوەو وەچەکانتان، هەوڵبدە هاوکاری ئەوکەسانە بکەیت کە پێویستیان بە یارمەتی هەیە، باشترین وانە بۆ منداڵەکانتان تەماشاکردنو لاساییکردنەوەی ڕەفتارو کردارە باشو پەسەندەکانە کە ڕوو دەدەن لە چواردەوریاندا.

٢- لە زووترین کاتدا منداڵەکانتان فێری هاوکاریکردنی یەکتر بکەن، جا ئەو دەست پێکردنە گەر لە ماڵی خۆشتانەوە بێت، «ئەو دەتوانێت کورسییەك بخاتەوە شوێنی خۆی، دەستی دایە گەورە بگرێت تا لە جێگەکەی خۆی هەڵبسێت، یا کتێبێك بۆ خوشکو براکانی بخوێنێتەوە».

٣- ڕاستەوخۆ فێری بەرپرسیارییەتی کۆمەڵایەتییان بکەن، ئەم بۆچوونەیان پێ بڵێن: (تۆ دەتوانیت کۆمەکی ئەو کەسانە بکەیت کە هێندەی تۆ هەلو دەرفەتیان بۆ نەڕەخساوە).

٤- هەلێکی گونجاو بڕەخسێنە تا شارەزایی پێ بدەیت بەوەی کە لە جیهاندا چی ڕوودەدات. باسی ئەوە بکە کە چۆن دەتوانێت هاوکار بێت تا جیهانێکی باشتر بێتەدی، ڕوونی بکەرەوە کە دەتوانرێت لە ماوەیەکی کورتو بە هەوڵێکی کەمی بێ پسانو بەردەوام دەتوانرێت گۆڕانکار گەورە بکرێت.

٣- تواناو حەزی منداڵەکانت بدۆزەرەوە تا بتوانن شوێنی گونجاوی بۆ پەیدا بکەن، بۆ وێنە ڕێکخراو، یا هەر شوێنێك کە ئەم بتوانێت حەزو تواناکانی بێنێتەدیو دەریبخات.

٤- ڕێگەیان بدەن تا ئەو جلو بەرگانەی کە بۆ ئەم ناشێن، ئەو یاریانەی بۆ تەمەنی ئەم بە کار نەماون بیان بەخشێت، فێری بکە تا بۆخۆی دەست بکات بە بەخشینیان بەسەر نەدارو هەژارەکاندا.

بۆئەوەی منداڵ هەر لەو قۆناغەوە دەست بە هاوکاریکردن بکات ناخی پڕبێت لە یارمەتیو ببێتە حەزو خولیا، هەمیشە بە دوای ئەودا وێڵ بێت، وایلێبێت جۆری کۆمەك دروست بکات، پێویستمان بەوەیە هەوڵبدەین تا ئەم خاڵانەو شت گەلێکیتر بکەینە دەستور، گەر وامان کرد پاش ماوەیەك نەوەیەکی هاوکاریکار گەلێکی ئاسوودە خەڵکانێکی کۆمەککار ئایندەی وڵات بەرەو ئاقارێکی باش دەبەن، ئەوکات نەوەیەك دروست دەبێت لە یارمەتیدانو هاوکاری یەکدی.

شێخانی

پێشماڵئاوایی

# هەستێك بۆ خۆشەویستان

زۆرجاران خامەم هەڵگرتووەو ویستومە چەند دێڕێك بە وتەی سپی ڕەشکەمەوە، وەلێ دوایی ژێوان بوومەتەوەو دەستم لە نووسین هەڵگرتووە!

ئەمجارەیان نەمتوانی لە دەستوری دڵم یاخی بم، بەرامبەر هەستێکی بێ سنووری نێو دڵی بچکۆڵەم، چم پێ نەکراو منو خامە دەستەو ئەژنۆ تەسلیم بووین، چونکە ئێوە ئاشنان بە هەموو دەزوولە خوێنینەکانی دڵم، ئێوە لەو جۆرە مرۆڤانەن کە ناکرێت ساتێك فەرامۆش بکرێنو یادیان لە نێو دڵو وێنەیان لەبەر دیدەو نیگادا ون بکرێت، وەختێك مرۆڤێکت بە مانای وشە لەم ڕۆژگارەدا دێتە پێش چاو، چۆن دەتوانیت شەیدای نەبیتو هاودەمیو هاویاری بە ئاوات نەخوازیت.لەگەڵ وەها مرۆڤێکدا، مرۆڤ ڕۆحی لە ساباتێکی بەهەشت ئاسای ئاودامان‌دا ئاسوودە دەبێتو لە جیهانی

فریشتەکاندا خۆی دەبینێتەوە، تەنها هەست بە چرپەی وتەی خۆشو خەندەی ناسكو شنەی شەماڵی خۆشەویستی دەکات.

لە دنیایەکدا دەژی، دوور لە ڕەنگە تاریکەکان، دوور لە ڕقو کینە، ستەمو ناڕەواییەکانی بە ناو مرۆڤان!!

لە وێدا مرۆڤ خۆی دەدۆزێتەوەو شانازی بە مرۆڤایەتی خۆیەوە دەکات.

چونکە وەختێك مرۆڤ لە جەنجاڵی ئەم دنیا شێواوەدا، لەم شەوگاری ئەنگوستە چاوەدا، مرۆڤێکی وەفادارو بە ئەمەكو بەڕێزو بە سۆزی دێتە بەر دیدی چاوی، هەمیشە چاوەڕوانی ناتوانێت شەیدای وەها مرۆڤێك نەبێتو هەمیشە لە خەیاڵیدا نەژیو بۆ هەمیشە نەیکاتە هاودەمی ڕۆحی!

لە جیهانێکدا کە وشەکانی خۆشەویستیو وەفاداریو ڕێزو مرۆڤدۆستیو برایەتیو دڵسۆزی

بە دەست ستەمی مرۆڤەکانەوە دەناڵێنن، شتێکی زۆر گرانبەهایە کە جارێکی دی ئەم وشانە لە دۆخی سروشتی خۆیاندا دووبارە ببنەوە!!

لەبەرئەوە خۆشەویستانم لە ناخی دڵمەوە خۆشم دەوێن!

*حەز دەکەم هەر کەس لە ئێمە هەستو سۆزو وەفاداری خۆی بۆ خۆشەویستانی دەرببڕێت، لاپەڕەکانی برپاریش بۆ ئەم مەبەستە والایە.